# دیوانا داهی

**مەلا نەذیرێ شێخ محەمەد ظاهرێ بەدەوی**
**( ١٩٣٣ ـ ١٩٨٦ )**

**پشكێن ( ١ ـ ٣ )**

# مەلا نەذیر
# وئەڤ دیوانا وی

وەکی د دەسپێکا دیوانا بێ خەوی ( گازیا بەلـــەنگازا ) ژی دا مـە گۆتـی : ل وی دەمـێ ستێرا جەگەرخوینێ شاعر بلند دبوو ، و ل پێش چاڤێن ملـلـەتی گەشـاتی ژ خـۆ ددا هژمارەکا دی ژ شاعـران یـێـن کـــو ل وێ شـــۆپـێ چـووین یا ئـەو لـێ چـووی بەرهەمێ خـــۆ ب کرمانجی‌یـەکا رەهـوان ڤـەدهاند بەلـــێ ئـەو ناڤداری‌یـا ب دەسـت جەگەرخوینی ڤە هاتی ب دەست کەس ژ وان ڤە نەهات .

وهەر ل وی جهێ جەگەرخوین وجیلێ وی ژ شـاعران گەهشـتین وداهێـنـان کـری ڕەنگەکێ دی یێ شاعران هەبوو خـــودان بەرهـەم ودیـوان ژی بـوون ، بـەلـــێ نـاڤ ودەنگێـن وان ـ وەك شـاعر ـ ژ چارچووڤەیـەکێ زێـدە بەرتـەنگ دەربـاز نەبووینــە ، چونکی ـ ژ بەر گەلـەك ئەگەرێن جودا جودا ـ دەلیڤە بۆ بەرهەمێ وان نە هاتی‌یــە دان کو ڕۆناهی‌یێ ببینت ، لـەو ئەڤ بەرهەمە د ناڤ بەرپەڕێن دەستنڤیسێن وان دا ڤەشارتی ما ، هندەك ژێ ژ بەر کاودانێن سەخت وگران ژ ناڤ چوو وهاتە سۆتن ، وهندەك ژێ د پەرتۆکخانەیێن تایبەت دا ل بن تەخەیێن تۆزا ژبیـرکرنێ هاتە بەرزەکرن .. و ب ڤــێ چەندێ ئەدەبێ کوردی ژ گەلـەك دەنگێن زەلال وئاواز شرین هاتە زڕبـارکرن ! ومـەلا نەذیر ژی ـ وەکی برایێ خۆ مەلا بەشـیـری ـ خودانێ ڤێ دیوان نوکە ل بەر دەســت ، ژ وان شاعرانە یێن مرۆڤ دشێت بکەنە نموونە ل سەر ڤێ گۆتنا خۆ یا بۆری .. و د ڤێ پێشگۆتنا خۆ دا مە دڤێت ڤی شاعری ب کورتی بدەینە ناسین .

## مەلا نەذیر .. کی بوو ؟

د پێشەکی‌یا دیوانا ( گازی‌یا بەلەنگازا ) دا مە ئاشکەرا کربوو کو هەردو شاعرێن برا مەلا بەشیر ومەلا نەذیر لاوێن شێخ محەمەد ظاهرێ کورێ شێخ مصطەفاییێ بەدەوینە ، وهێڤێنێ وان ژ بنەمالا سەییدێن ( کەربنێ ) یە .

هەر وەسا مە گۆتبوو کو بابێ وان شێخ ظاهر مرۆڤەکێ خودێناس وکوردپەروەر بوو ، ووی پشکداری‌یەکا بەرچاڤ د شۆرەشا ئاگری دا هەبوو ، وەکی سەرۆکێ شۆرەشی ئحسان نووری پاشا ب خۆ د بیرهاتنێن خۆ دا ئیشارەتێ پێ ددەت .

مەلا نەذیرێ شاعر ژی وەکی برایێ خۆ مەلا بەشیری ل گوندێ ( عەزیمێ ) ل دەڤەرا ( کەربۆرانێ ) ل کوردستانا باکوور هاتبوو سەر دنیایێ ، بەلێ ئەو ژ برایێ خۆ بچویکتر بوو ، چونکی ئەو ل سالا **١٩٣٣** ز بووبوو ، وهێشتا یێ بچویك ، و ژ ئەنجامێ شکەستنا شۆرەشا ئاگری بابێ وی نەچار بوو ب مال وعەیال ڤە وارێ خۆ بهێلت و ژ زولما ترکان برەڤت ووەکی هژمارەکا نە یا کێم ژ کوردان بەر ب رۆژئاڤایا کوردستانێ ڤە مشەخت ببت ، وپشتی گەهشتی‌یە ( سۆری ) یێ ل چەند گوندەکان خۆ ڤەگوهاست حەتا دویماهی‌یێ ل گوندێ ( کانیا نەبی ) ئەوێ دکەفتە پارێزگەها ( حەسەکە ) ئاکنجی بوو .. وپشتی هنگی ب چەند سالەکان وی قەستا گوندێ سێ گران ( سبع جفار ) کر ، وحەتا مری ژی ل ( **١١ / ٢ / ١٩٨٦** ) هەر ل وێرێ یێ ئاکنجی بوو .

هەر ژ زارۆکینی‌یا خۆ وی دەست فەقیاتی‌یێ کر وهنگی راوەستیا حەتا ئیجازا مەلاتی‌یێ ژ سەیدایێ خۆ شێخ ئیبراهیم حەقی وەرگرتی ، وپشتی وەرگرتنا ئیجازێ ئەو موژیلێ کارێ مەلاتی‌یێ بوو وبوو ئیمامێ مزگەفتا گوندێ سێ گران کر . [1]

---

(١) زانین ل دۆر ژین وسەرهاتی‌یا مەلا نەذیری ژی وبەرهەمێ وی مە ژ برازایێ وی هەڤالێ مە ( ئازاد عەبدللاە ) ی وەرگرتینە ، ئەوێ خەمەکا باش ژ ساخکرنا بەرهەمێ هەردو مامێن خۆ یێن شاعر خواری‌یە .

وپەیوەندییێن وی ژی وەکی یێن برایێ وی مەلا بەشیری د گەل هەڤالێ وان مەلا نووری‌یێ خانی د موکم بوون ، وڤێ هەڤالینی‌یێ ژ لایێ ئەدەبی ژی مفا گەهاندێ چونکی مەلا نووری ژی ئەدیب وشاعرەکێ ژێهاتی‌یە وخودانێ هژمارەکا بەرهەمێن شعری‌یە کو مخابن هێشتا چو ژ وان چاپ نەبووینە .

وژبلی زمانێ کوردی مەلا نەذیری زمانێن عەرەبی وترکی ژی دزانی ، ووی شعر ب ڤان هەردو زمانان ژی ڤەهاندینە .

## مەلا نەذیر وکوردینی :

هەر کەسێ ڤێ دیوانا مەلا نەذیری بخوینت دێ زانت کو ئەو مرۆڤەکێ کوردپەروەر بوو ، وئەڤ چەندە تشتەکێ غەریب نینە ژ بنەمالا وان یا کو هێژ ل سەر دەمێ بابێ وان شێخ محەمەد ظاهری ب کوردینی‌یێ وبەرەڤانی‌یا ژ مافێن رەواییێن مللەتێ کورد هاتی‌یە ناسین ، وسەرا ڤێ چەندێ تووشی مشەختبوون ودەربەدەری‌یێ بووی ، وهەر چەندە ژ شعرا وی ئاشکەرا دبت کو پشتەڤانێ پارتی بوو ، ورەحمەتی مەلا مصطەفایێ بارزانی جهەکێ مەزن د دلێ وی دا هەبوو ، بەلێ دیارە ئەو وەکی برایێ خۆ مەلا بەشیری تێکەلی سیاسەتێ وژینا حزباتی‌یێ نەبووبوو ، بەلێ ڤێ چەندێ ئەو ژ هندێ نەدا پاش کو دەلیڤەیەکا مەزنتر ژ پشکەکا سی‌یێ ژ ڤێ دیوانا خۆ بۆ بابەتێ کوردینی‌یێ تەرخان بکەت .

## بەرهەمێ مەلا نەذیری :

مەلا نەذیری ئەوێ ناسناڤێ خۆ یێ شعری کری‌یە ( داهی ) [1] دو بەرهەمێن بەرچاڤ یێن هەنە :

یێ ئێکێ : ئەڤ دیوانا وی یا شعری‌یە ئەوا نوکە ل بەر دەست وناڤێ دیوانا داهی مە ل سەر دانای .

یێ دووێ : دیوانەکا دی یا شعرانە بەلێ ب زمانێ عەرەبی‌یە .

---

(١) داهی یان ( داهیە ) پەیڤەکا عەرەبی‌یە بۆ وی مرۆڤی دئێتە گۆتن یێ عاقلدار وشارەزا بت .

**ديوانا داهى :**

ديوانا داهى ـ ئەوا نوكە ل بەر دەست ـ ل دويڤ لێكڤەكرنا شاعرى ب خۆ ژ سێ پشكان دئێت ، پشكا ئێكێ ـ ب ڕەنگەكێ گشتى ـ ل دۆر بابەتێ ئەڤيندارىيێ وعشقێ دزڤڕت ، وپشكا دووێ ل دۆر چەند بابەتێن كەسينى وجڤاكى وپێگۆتنان دزڤڕت ، وپشكا سىيێ بۆ بابەتێن كوردينىيێ يا تەرخانكرىيە ، وديوان هەمى ژ ( ١٢٩ ) شعران پێك دئێت .

وكارێ مە د ئامەدەكرنا ڤێ ديوانێ ژى دا ـ وەكى ديوانا مەلا بەشيرى ـ ئەو بوويە ژبلى ڤێ پێشگۆتنێ مە ديوان ڤەگوهاستىيە سەر ڕێنڤيسا مە يا نوى ، و ل دويماهىيێ ژى مە فەرهەنگۆكەكا بچويك بۆ پەيڤێن گران و ب زەحمەت بەرهەڤكرىيە ، هيڤىيا مە ئەوە ئەڤ ديوانە ژى ببتە دەولەمەندىيەك بۆ شعرا كرمانجى .

**تەحسين ئيبراهيم دۆسكى**

**دهۆك / گولانا ٢٠٠٤**

( ١ )

# مه دی شەوقەك

مــه دی شەوقەك دهاتی خوار ب سەر دا

ل دل دانـــی دلـیٚ مـــن قـــەط نـەبەردا

چ خارەك بوو د ناڤ گولـیٚ دە مـن دی

گــەلـــۆ ئـــەز ویٚ هلینم ما ژ عـەردا

مــه هـیـڤـی کر ژ باری لـوطف وئحسان

بـدیٚ مـن یـەك گـولـیٚ نیٚرگز د بـەر دا

خـــلاص بـن أم ژ ڤـیٚ جـەور وجـەفائیٚ

ژ ڤـیٚ حـــوزنـیٚ وعشقیٚ مـن خـەبەر دا

نـەکـن لـەومـا ل من هوون ئەی هەڤالنۆ

چ ئـــەز بـیٚـژم هـەمی ئەو هـەر ژ دەردا

مــه دەردیٚ خـوه گرانـتـر کـر ژ مـنقار

مـه دل سـۆتی ب سەر یەك قـوزە قەردا

بـەســە داهـــی ژ ئـەفـغـانـا مـــەنـالـه

نـــەذیـــر نـائیٚ حەسیٚبیٚ کول ب وە ددا

( ٢ )

# ژ عشقا سۆرگولێ

ژ عـشـقـا سـۆرگـولـێ ئیـرۆ دبووم مەجنوون د سالـێ دا
چ دەرب دانـــی ل مـن مـیـرۆ ئـەمان خـسـتم د چالـێ دا
فـەلـەك دیـسـا حـەبـیـب کـوشتم ب درەبا ئاورێن چەشمان
نـزانـم کـو نـەیـار ئـــەو بـوو ژ مێژ ئەڤ بوو د دل وێ دا
مـــە طـــالـــع چـــوو ل دونیایـێ نـەدی بەنگیـن ل ئەیوانێ
تـەمـام بـــوونـــە ل من سـه سال نەدی من ئەو سەمائێ دت
مـــە دی دژمـــن پـەیـاپـەی تـێـن ڕم وخەنـجەر ل من دانە
مـە جان دایـــە ب پـــەروانـــێ دەما دی دوهنێ رەوخێ دا
د رەوضـا گـولـسـتـان سـونـبـول ژ بورجان هاتنە خوارێ
ب ئەعـدادێ سێ سەد ئەو بوون د بورجا ثەور وحەملێ دا
مـە عـاقـــل چـــوو ژ بـەر شـەوقـێ هلاڤـێتم ب غەربێ ڤە
ب چـــەرخ ودەورانـــــێ فـولـکـا شـێـریـن مایە د وانێدا
صـــەیـاد چـــوونـە ل بەر بەحرێ ب دەرب وتیر ورم قتال
هـلاڤـێـت حـیـجـاب وپـەردە شـەمال دەر بوو د قبلێ دا
( فـلا بـأس ) ب زاریـنـێ چـقـا گـەر ئـەز کـو قابل بـم
تـــەنـــەززول تـێـتـە پـەروانـێ وێ جان دایە د ضەوئێ دا
تـەکـەسـسـور دە دبـم لائـق ل بەر ئەیوان وسەد بورجان
ژ ســێ سـەد سـێـزدەهن زێدە دبوون ظاهر د وەجدێ دا
وا جبـریل قاصد خوەش هاتی ژ ئەصحابان ڕە خەگ دانی
چ بـەلقیسەك ل تەختان دی وەکی هودهود د ذەبـحێ دا

گـــەلـــۆ مـــا ئـــەز كـو بـبـيـنم ب تەمثيلـــیٚ د دو قاصد
د نـاڤ بـوغـچـیٚ گولـیٚ خاران دبووم بولـبول د عشقیٚ دا

د عـشـقـا عـەنـتـەر وعـەبـلا سـەد وسیٚ تیـر ورم سلاح
پـەيـاپـەى ئـــەو ل وان باريـن مـەيدان وجەنگ وحەربیٚ دا

چ خـوەش عاشـق حەماديـمـە هـلال ديـتـى د بـورجان دە
ب پەروازا خـەنـجـەر كێشا د بوو مـەحبووس د قەيدیٚ دا

جەليلە مايـە هەر مەحزوون وعاشق نەگەهشت مەعشووق
نـــەذيـــر جان دا ب ئـەفـغـانـا داهـى مـايـە د خـەونیٚ دا

( ٣ )

# مه غەم خوارین

مــه غــەم خــوارین ب ئاهیــنــی ب ئــاه ونـــالـــەمـــه یا رەب
مـــه دی بـــوو ئـەو شەڤا ئەینی ژ لـــەو ئـەز مـەستەمـە یا رەب

کـــو مـەستم ئەز ژ بەر شەوقیٚ ل غـەربـــیٚ دا حـــەتـا شـــەرقـیٚ
بـلا بـــیٚ ئـــەو وەکـی بـەرقـیٚ ئـەمـا ئـەز حـــەوجـەمه یا رەب

ل ئـاسـتـان ئـــەزم حـــەوجـــه ل دۆرا ئـــەو ل چـــار بـورجـــه
بـلـــەیـزن ئـەم ب سەطرەنـجـه ب دل نـال وغـــەمـــه یـا رەب

ئـــەگـــەر بیٚـت لامـعا نـووریٚ بـــدیٚ مـــن ئـاڤـا فـــەرفووریٚ
نەظەر کم ئـەز ل مـەکـسووریٚ بـــەلـیٚ سـوکـرانـەمـه یا رەب

ســوکـــران ئەز ب ویٚ بەنـدیٚ تـه سۆتـم ئـەز وەکـی فـندیٚ
صفەت مصباح فانـووس زەنـدیٚ ژ لـەو پـەروانـــەمـــه یـا رەب

مـــه دل دائـــیٚ ب شـــەوقـیٚ ڤه شـــەفـــەق دابـــوو ژ قـبـلـیٚ ڤه
ل بـەر چاڤـیٚ مـــه ئەو هـیٚـڤـه نـه کـو ئـەز تـازەمـــه یـا رەب

حـــەتـا کـەنـگـی بـکـم زاری ژ بـــەر قـــەبـرا ڕەش وتـــاری
دل وجانـــیٚ مـــه خوون خواری فـــەقـەط پـورِ خستەمه یا رەب

حەتا کەنگی بکم نالین          گەلۆ دیسا هەیە ئەو بین
ب لجنە کو پەریێ ئەو بین          زەمان وهەر دەمە یا رەب

تو رەحمیێ کە د عشقیێ دا          چ شێرینە د وانێدا
ببم مەدهووش د چییێ دا          کو مریێ بازەمە یا رەب

فەلەك دیسا کەتم چالیێ          د زیندانا مەمیێ ئالیێ
رەقیب هاتە ل نك پالیێ          چ کو تەمشیلەمە یا رەب

گەلەك چووبوون بەلەنگازی          وەکی خانی وشیرازی
جەزیری یەك دبوون غازی          وەکی وان حەوجەمە یا رەب

( فلا تبكي أيا داهي )          ل سەر وی ذاتیێ وەك ماهی
چ سۆرگول بوو ب تەباهی          نەذیر بێچارەمە یا رەب

( ٤ )

# دلبەر دهات

دلــبــەر دهات ژ بورجان سێڤەك ژ دەست خوە ئاڤێت
مە گرتی ئەو ل پەردان دەرمان ل دل مە خوەشت تێت
دلبـەر نـازك شـەپـالە جـامـا د دەست دا ڕەنـگـیـن
وەجـهـیٚ ویٚ وەك هـلالـە رەمـزا ل ویٚ مـا کیٚ دیت
رەمـز وتـیـرێـژیٚ دلــبــەر ســەد کـول کرین د دل دا
جـەرگ وهـنـاڤ دسـۆتـن دەربا کو دانی کیٚ دیت
ئـەم دچــوونـە سەمائیٚ مە دەست ب هەڤڕا دهەژاند
چـنـکـە چـنـکـا خـڕخـالـە دائـم ژ بـەژنا ویٚ تێت
دەنـگـیٚ طـەوق وگـەردنیٚ ل سەمائیٚ ب هەڤ کەت
ژ مابـەیـنـا دو بـرهـان تـیـرێــژەکـی نــوو ئاڤـێـت
شـــەوقـا تـیـرێـــژە دلـبـەر ژ ئـەسـمـانـا هاتی خوار
هـاتـی ژ بــۆ جـــەمـاعـەت ل مـحـرابـیٚ شامل تێت
وەقـتـیٚ مــن دی ب چەهڤان حوسن وجەمالە دلبەر
بـیٚ هـش دبـــووم د جیٚ دە صەبرا من قەط نەما تێت
فـەلـەك ما قـەی ئەز چ بکم تو نائیٚ قە ب دەستیٚ من
نـەذیـر جـەگـەر تـە سـۆتــن د دل دە ئاگـر وپێت

( ٥ )

# کەس نە پرست

کـــەس نـــە پـــرســت ل تـە ئیرۆ تو ب ئەفغان چ کت

کـــو رەســـوولـەك تـە نـەبت ما تو ب عنوان چ کت

عومری تە بوو بیست ویەك سال تە نەکر قەنجی ژ خوار

کـــو قـــووەتـــەك تـــە نەبت ما تو ب شەیخان چ کت

ئـــەگـــەر سەد جاری کەرامەت کو د دل دە تە هەبت

کـــو نـــەبـــت پـــیـرە حـەلال ما تو ب فعلان چ کت

ئـــەگـــەر عـەقلی تە نەبت فکری ل تە ئەو کۆر نەکی

لەف ونـــەشـــرەك تـە نەبت ما تو ب حەیوان چ کت

تـە نـەبـت دۆست وهەڤال دا تو ل وەخت غالب ببت

کـــو نـیـشـانـــەك تـە نـەبت ما تو ب روئیان چ کت

ئـــەگـــەر دۆسـتـانـی ل پیشیا تە زەمانەك قەگ نەبت

ب نـــەنـــاســـی تـو ببـیـن ما تـو ب دەوران چ کت

تـــە نـــەبـت دائم وەزیر هەر وەختی گوهداری تە بت

ما فـوجـائـەت ئـەمـرەکی حوکمی بی ئەعوان چ کت

ما کـو دل صـافـی نـەبـت رۆژ وشـــەڤ ذکری بکت

ئـسـتـغـنـایـەك تـە نـەبـت ما تـو ب لـیسان چ کت

رۆژ وشـەڤ دائـم خـەبەر دی کو تە راستی قە نەبت

مـوسـتـەمـعـەك تـە نـەبـت ما تو ب وەعظان چ کت

لازمـە مـــەعـشووق هەبت داهی تو هەر قەستی بکت

وەکـی ضـەوئـەك لـی نـەبت ما نەذیر پەروان چ کت

( ٦ )

# دلبەرا مثلـــی قەمەر

دلبـەرا مـثـلـــی قـــەمـــەر دائـــم تـــووی بـــۆ من نەصیب
تـــە دگـــۆت بـــۆ مـن خـــەبـەر کو تو نەبت مال ونەصیب
( الله ، الله ) ئـەز دنـالـم تـە چـیـکـر ئـەڤ رەنـــگ مـثال
تە نڤیسی ( حی ) د گەل ( میم ، دال ) ل پەی کریە تەرکیب
مـــا کـــی هـــەیـە هەر وەخت ببینی ئەو نەبت سوکران پی
کـو ل بـــەر وی هـەبوو شەوقەك ئەڤ چ بوو ئیرۆ عەجیب
کـــەس نـــەکـــن لـــــەومــا ل من کو ئەز دبیژم ئاه وئاه
چ تـــەجـــەلـــلا بـــوو خـــودا دا ل مە ئـیـرۆ ب حەسیب
کـــو دچـــت ئـــەو لـەو ژ نك من دل دبت پیت وپەرەنگ
قـــامـــەت وبـــەژنـــا شـەریف حیستـر ل مە کرنە لەهیب
هـــەر دەما بـیـمـە تـــەمـــاشـــا دل دبـت بـولـبولـی گول
مـثـلـــی رۆژی دەرکـەڤت یەك جاری ئەو دی بت غەریب
دائـمـا لاری جـاری کـم وەصـــفـــی وی نـابـــن تـــەمـام
ئـــەڤ چ فـــەوج وســـرریـە ئـەڤ چ فەصیل و چ کەتیب
هـــەر دەمـــا ئـــەو تـیـن پـەیـاپەی مە کەبەد بوویە سەقەر
کـــو نـــەظـــەر کـم ئەز ل وان ناڤدە هەیە من یەك نەجیب
ئـــەز دبـــووم ســـوکـرانی وەختە هش نەما بوو قەط ل من
مـــە نـەپورسی چوومە رەخ دە گۆتە من : ( قف یا أدیب )

ب جــــەمــالـی نــەبـــە مــەغروور تو بدە مەدحی خودا

تــو بــــکـــيـــشـــا قــەلـــەمـــا عشقی توی نابت کەئيب

مــا تـــووی ئـــيـــرۆ ذەلـــيـــل بـــۆنـا فـنـجان داهی من

تــو دبـــت مـــەدهـــووشی وەختە ئەی نەذير بوويە لـەبيب

( ٧ )

# مه د دل ده

مــه د دل ده هـــهیـــه نـــارهك تـــو ژ پـیـتان مهكه بهحث
ئـــهز دنـــووشـــم مـــهی ژ جامی تو ژ رهنگان مهكه بهحث

مـــا گـــونـــاهـــهك زیـــده بـــت ئـیـرۆ ژ ذهوق ولـهذذهتی
مـا كـــو نـعـمـهت تـه ههبت ههر ژ خهطایان مهكه بهحث

ســـهد ویـــهك جـــاری كـــرامـــهت كو د دل ده ته ههبت
بـــده شـــوكـــرهك بـــۆ ئـیـلاهی تو ب لیسان مهكه بهحث

ئـــهگـــهر ســـــهد جـــاری ل تـهختـا تـــو ببـینی دلبهری
دورری یـــاقـــووتـــی ل دۆری تـــو ژ وهصفان مهكه بهحث

لـوئـلـوء وكـافـــوور وعـهنـبـهر تـو ل نـك وی ههر ببین
تـــو تـــهمـــاشـــاكـــه ب چاڤان تـو ژ شكلان مهكه بهحث

وهریـــن دا بـــچـــنـــه طـــهوافـا خـــهط وخالین ئهنوهری
ئـــهم طـهواف كن پور ژ ئهصلان تو ژ زولفان مهكه بهحث

مـــه ژ ڤـــی بـــهحـــثـــی كـیـشـان ئهفغان ونالین كو ژ دل
دا حـــهلاوهت پـــهیـــده بـت ئـیـرۆ ژ بهحثان مهكه بهحث

ما كو مهعشووق نهدی دهستوور تو ب جههدا خوه چ كت
چـــمـكـی رهحـما وی پوره تو ههر ژ لوطفان مهكه بهحث

وهیـــه داهـــی تـــه د عـشـقـی دا كـو عومری خوه بوار
كـــو نـــهذیـــر ئـیـرۆ دنـــالـی تـو ژ دهردان مهكه بهحث

( ٨ )

# ژ رەمزا دلبەرا حووری

ژ رەمــزا دلـــبـــەرا حـــووری　　گــريــدابــوو ل ســەر سەر تاج
وەكــى زيـــرى شـــەفـەق مۆرى　　وى گەردەن بوو ژ عەظمــى عاج

دبــووم جــوثــشە سـەرى بى پا　　طـەبيـب كـو بيـن ژ ئــەوروپا
داوى نــاكــت د گــــەل دل پـا　　نــەبــت گـەل جامـەيەك زوجاج

ب جـامــى تــم دبــت ساغلەم　　ژ بــاطــن ئــەو دچـــت ئـەلـەم
مـەكـيـشـان پور دەرد وكول غەم　　( إذا الليل ) دبــــت ئــــەوداج

چ خــوەش روئـيـا ب وەحـدانـى　　رم وتــيــر وبــــــەرەك دانــــى
مــە جــان دايــە ب ئـەفـغـانـى　　مـە خــوونا دل ( جـرت أمواج )

دبــووم ســائــــل ل ئــاسـتــان　　دبـــن دلـــكـول ل سەر بورجان
مــە روح دا كــەوكەب ومرجان　　ب رەنــگ حـوورى لبس ديباج

نــەظــەرى تــو نـــە هـيـژامـە　　بـــەلـى ئـيــرۆ عــەلـيل مامە
داهـــى دەرمـــان ل تـــە دامـە　　نــەذير كـەتـيـە ل ناڤ ئەمواج

## ( ٩ )

# ژ بەر عشقی دنالم

ژ بەر عشقی دنالم ئەز    عەقیق وعەنبەری دەرخە
ژ بەر عشقی دکالم ئەز    شەڤ ورۆژی ل کەمبەر خە

گریدە چیچەك وئالا    تو هلکیشە وەرە بالا
ل بەر چاڤی مە عەبدالا    ل دۆری ئەز بدم چەرخە

بلا بیت و ل سەر تەختە    چقا رۆژا ل وا وەختە
گەلۆ کا عارفی وەختە    فەلەك کا مەعرووفی کەرخە

مە دل چوویە ب دیداری    خیال هاتن د غوباری
کو سووسن بوون ل تە باری    مە دەرد بوو ئەو کەڤۆك فەرخە

کەڤۆك فەرخە ل ناڤ بوغچان    وی گەردەن کەوکەب ومرجان
ب مەش تیت قەصر وسەد ئەیوان    وەکی گور ئەو تیتە بەرخە

بورج وئەیوان خویابوونە    ئیشاراتی مە ئەبروونە
فەرەزین گەل فەرەس دونە    ل هاویر دۆر ددن چەرخە

رەخ وفیل ئەو ب بەز هاتن    ل نك فەوجی ئەون هاتن
مە گۆ داهی ل بۆش هاتن    ل سەر ئەصلان نەذیر چەرخە

( ١٠ )

## من د دل كول پور هەنە

مـن د دل كـول پــور هـــەنـه      دائـم د دل رەشـــمـار چـەرخ
كـۆم وبـــەنــــدى دژمـــنــــه      بـــەردانــــه دل ئـازارى چەرخ

دلـــبـــەرا ديــمـــى ب نـــوور      حـوورى وپـەرى ئەو تينه دۆر
تـيـنـه سـەمـائى بـى قوصوور      گـۆڤـەنـد كرين ئيڤار چـەرخ

ئـيـڤـارى گـۆڤـەنـد وا كرين      چـيـچـەك ل سەر زولفا كرين
چـەشمى سياه مەكحوول كرين      ( هـاتـن ) سەما غوبار چـەرخ

سـەلـــوا ل مـــن رۆنـى دكـر      عاشـق ژى لـەو بـى هش دكر
كـەمـبـەر ل بەر زير ئاب دكر      چەنگ ونەيى شەعار چـەرخ

ڤـــان چـەرخ وبائـى دلـبـەران      خـســتـن د دل سى سەد سنان
مـن هـەر ژ بـــەر كـريه ئەمان      هـاتـن ب بـەر نـەيـيار چەرخ

تـيـنـه تـەمـاشـايـى گـەلـەك      زولـفـى سـيـاه چاڤين بەلـەك
دۆرا سـەمـائـى بـوون خەلـەك      دا ئەم بـبـن گـوهـدار چەرخ

حـەلـقـه دبـــوون زيـر وزبەر      ئـەصـلان ل سـەر مل دانه دەر
مـەشـها ل بەر ئەسوەد حەجەر      دائـم ددن دلـــدارى چـــەرخ

ئـەسـوەد حـەجـەر مـن قبلـەیە نابـت قـەبــوول بـی عومرەیە
دەرمـانـی دل وەصـــلا تـــەیـە بــەس تو بدی یەك جار چەرخ

داهـــی دبـــیـــژت یـــا دەلال بـیـمـە طـەوافـا زولف وخال
مـن غەیری وا نینە نینە مەجال عـشـقـا نەذیر غەددار چـەرخ

( ١١ )

# ئیرۆ ژ بەر ژانا د دل

ئـــیــــرۆ ژ بــەر ژانــا د دل		دیــســا ژ نــوو دل شەووشانــد
رەمــزەك ژ نــوو ئاڤـیـهـتە دل		مـیـلاك ژ خــوونی نەقـقـشاند

نـەقـش وخەطــی رەببی ئەحەد		سـۆتــن ل مــن دائــم كـەبەد
داد ومـــــەدەد داد ومـــــەدەد		جــان ودلـی مــن هــەررشاند

جــان وجـەگــەر تـالان كرن		وەرسـل ژ نـوو هوورهوور كرن
مەحبووب ژ من پور دوور كرن		یــەك قــژگــی لیـدا رەڤـانــد

مـامــە تــەنــی تـم بـی هەڤال		یا رەب ئـەریـنـی زولـف وخال
بــیــمــە طــەوافا وی دەلال		نــووڤــە دلـی مــن شەووتانـد

ئــیــرۆ بـــریــنــداری دلـم		ساعـەت ب ساعـەت دلكولـم
مـوهـتـی‌یی مثلـی ئـەووەلـم		سەد شیش د جەرگی دا تەوانـد

بـی مـرووەتی ئنصاف نەهشـت		دانــیــنــە مـن سەد رم وخشت
عاشق ب رەمـزا تـم دكـوشـت		پــەردە ژ ســەر دیـمـی هلاند

رەمــزەك ژ وان دا مــن پـەری		سـۆتــی ل مـن دیـسـا سەری
ئـیـرۆ ســەحــەر داهـی مـری		جەرحین نـەذیـر زووڤە كەوانـد

( ١٢ )

# جرت دمع من العين

( جــرت دمـــع مـــن الـعـيـن ألا يا أيها الـمـحمود )
ئـيـشـارەت دا ژ مـا بـەيـنی ژ بۆ من هەر تويی مەقصوود
ب قوربان بم ل وی زەینی ب من دە سەهمەيەك مەوجوود
ژ طـەعــم وزەوقـەیـا عـەیـنی ببم سەجدە ( لـك معبود )
مـە بـر سەجدە د لـەیلی دە وشەرطەك من نەكر مەفقوود

تـو مـەعـبـوودی ژ خەلقـی رە دڤی من كو ب ئەسساسا
هـنـەك زیـڤ وهـنـەك زیـرە ژ دەسـتـی دۆستەیەك ناسا
حووری بی ئەو پەری پیرە ب من یا قووت وئـەلـمـاسـا
دڤـیـت مـن ئـەو ژ قـەبـری رە ژ بۆ وەنسا مە بی بساسا
د وی قـەبـرا رەش وتاری وە دژمـن هەر دبوو یەك دوود

ئـەیـا دۆسـتـی ( فألـهـكـم ) فەخرا كو ئەو د قەلبی دە
نـزانـــن كـــو ( فـأوصاكـم ) وی نوورا هەر د قەلبی دە
( عـنـدي نـور فــقــد جاكم ) ذەلیل بوومە د عشقی دە
( فـإنـي أشـفـي مـرضاكم ) دەما بیت ئەو سوجوودی دە
( سـكـرت أي بـحـبـهـا شــفـانــي مــالـك مـعـبوود )

گـەلـەك ديـسـا دنالـم ئـەو كو من دی چەشمەيەك جانا
كـەتـم پـيـلان وگـيرا ئەز غەمی دل بـۆ مـە جـەيـحـانا
بـبـم مـــەرحـــووم ب دائـی ئـەز هەر ئەوكا د عوشاقانا
ل بـەر رەحـمـا خـودايـم ئـەز شـفـا كت جسم وجانانا
دەوائـــی دەردی تـە عاشـق كافوور وعەنبەر ويەك عوود

داهـی ئـيـرۆ دكـی گـازی عـەفـوو كـە يا رەببی نەذيـر
ب صەوت وحـــس وپەروازی ل نك جامی دبوو ئەسير
ب رۆژ وشەڤ قـــەط نارازی ژ مەلـجەء رە تويی خەبير
ل دونيائـی بـــەلـەنـگـازی ب ئـــەمـر وفـەرمـانا قەديـر
جـەگەر سۆتن ب فەرمانی د مەسكەن بت ( دار الخلود )

( ١٣ )

# من دڤی تو من حسیبكی

مـــن دڤـــی تـــو مـــن حـسـیـبـكی مثلـــی ( خالد الولید )

ئــەز دبـم پـەروانـــی قـــەنـــدیـــل نـیـنـه ئـەو دائم عەتید

گـــەر تـویـی تـم حـــووری ذاتـی لـوطـف وئحسان وپـەری

دل ددت پـــەرواز وچـــەرخـــا مـــا ببـیـنـی رۆژا عـــیـد

دی چ بـــت یـارەب ژ ڤـــان نـەقـش وسـوئالـی بی جەواب

ئـــەز دزانـــم رۆز وشــــەب قـــاصـــد ل مـه بـوونـه بەرید

نـازك وشـــیـــریـــن كـــەلام سەد دو قـەداحن ئەو ل دەست

عـــەیـــن وئـــابـــی گـولـفـرۆشـان داگـەتـن نیڤا جەرید

خـــەط وئـــەبـــروویـــن دەلالـــه دكـــوژت عـاشق تەنی

طـــەوق وزنـجـیـری ژ زیـری ســـەر ســـەریـر مانه ل جید

مـــوبـــتـــەلایـەك خـوەش وەرت دی قەستا دەرگاهی ته كت

پـــور ددیـــت جـــەور وجـەفـا نەجـمەك ل وی نابت سەعید

هـــەر دبـت مـیـلاك وجـــەرگ خـوونـی د وان گرتی مەقام

بـــۆ تـــەمـاشـایـا مـوحـافـظ ضـابـطـی جـونـدی جـەدیـد

لـــەشـــكـــەر وجـــونـــدی مـــه ئـیـرۆ داخلی بورجا میزان

فـــەوج وتـــابـــووری ل زوهـــــره چـەهـڤـەنـیرن موستەعید

هــــەر دەمـــا تـیـن ئـــەو پـەیـاپەی مه كەبەد بوویه سەقەر

ســـەد رم وخـەنـجـەر ددەیـنـن دكـــوژت ئـــەو مـن عەمید

داویـــی جـــانـــی مــــه ئـــەو ئەزهەر دخوازم ژی شەراب

مـــەی د فـــنـــجـــانـــی بــــریـژت تـم ژ بـۆنـا سەد عەبید

جـــەوهـــــەر ودووری ل بـــورجان ئـەو ژ شـەوقـی تەییسین
وی ژ شــوعــلا وی دنــالـیـن ســەد قـەریب وسەد بەعید
شـافــیـیــی دەردی مـــە ئـــەو تـــەخـتـۆر ولوقمانەك تەنی
دا شـــفـا کـــت جـــســـم وجان شـوونا بـرینان من صەدید
ئـــەڤ چ حـــــوســـن ومـــوحـــبـــەتـە داهی ژ بەر دایە فغان
ئەڤ چ مەحبووب و چ مەعشووق ما نەذیر کەنگی ( تـعید )

( ١٤ )

# نیڕگزا نازك دەلال

نـــــێــــرگـــــزا نـــــازك دەلال　　مـــــن دی دهـــاتـــی ( یـومـئذ )
نـیـشـان ونـەقش وزولـف وخال　　ئـــەز وا دخـــوازم ( حـیـنـئـذ )

گـەر ئەو ب گـۆڤـەندێ وەرت　　سـەد پـێت د دل وێ پـێ كەڤت
رۆژ وشـــەبـێ پـێـت زێدە بـت　　پـــــەروانـــێ ئـاســتـــانـە ( إذ )

پـــەروانـــەئـــێ فـــغـــان دكـــر　　یەك گول بـوو بولبول دیـن دكـر
لال وضـــەعـــیـــف وژار دكـــر　　زانـــی كـــو مـن دل بـوویە ذیـذ

بـولـبـول د ناڤ خاران مـە دی　　نـیـشـانـەك مـەحـبووبان مە دی
یەك خەط غەلـەط قەط لێ نەدی　　وەك هـــودهـــودێ كـەلام لـەذیذ

نـاظـرێ نـەقـشـا هـــەر تـویـی　　تـم عـاشـــقـێ زولـفـان تـویـی
داهـی نـــەذیـــر سەروان تـویـی　　وەك ئـەوەلـێ بـت ( یـومـئـذ )

( ١٥ )

# دلبەر مە دی

دلــبــەر مـــە دی د قــوبــلــێ دە		ژێـــڕە مـــە ذو تـــمـــانـــە کـــر
ڕۆژە د بـــورجـــا حـــەملێ دە		مـــن ژ خــــوە ڕە قـبـالـە کـر

شـەوقــا وێ دایە پـەنـجـەرێ		خـال دایـــە دۆرا قـــەمـــەرێ
یا رەب شـوکـور دیـسـا وەرێ		مـە ژ قـەلـبـێ خوە فـغانە کـر

فـغـان دا ســـەر بـــەژنـا زراڤ		سـۆتـن ل مـــن جەرگ وهناڤ
خوون تێـکـەلـی تەشبیهی ئاڤ		ســـەد داغ د دل وەك لالـە کـر

داغ دانــە دل تــە چـاڤ بەلـەك		خـسـتـنە تـلـیـان دهـ خەلـەك
سەر کەمبەرێ دانـیـن گـەلـەك		مـن ژ خـــوە ڕە تـەمـاشـــە کر

هـاتـــن تـــەمـاشـایـێ فـەقـیـر		حـاجـی وصـووفی جان وپـیـر
نـیـڤـا بەغچە دبـوون ئـەسـیـر		ئەسوەد حەجەر طـەواف مە کر

طـــەوافـــا وان بـسـکـێ تـەتەر		ئـەصـلان ل سـەر وان دانە بەر
دل مـــە دانـــی ســـەر وا غـەدر		ڕابـــەری وان زولـفـــانـە کـر

زولـفـێ ل سەر دێمێ ب نـوور		مەقصەد ل مە ئەو کوورە دوور
داهـی ئـیـرۆ دبـوو مـەهـجوور		نـــەذیـــر ژ بـــەر ئـەمـانـە کر

( ١٦ )

# حەبيبا من دەلالا من

حـەبـيـبـا مـــن دەلالا مـــن شـــەپـال وشـــۆخ وپـورٍ هنەر
حـــەچـــى نـــاكـــت يـەقـيـن ئـيـرۆ ( فـإنه هو الأبتـر )
دنـالـم ئـــەز ژ نـــيـــشـــانـــا جـــەمـــال وحـوسنەيا دلبەر
گەلـەك نەقشێ غەريب من دين د عشقێ من سەلام كر سەر
مـە دى جارەك دبـوو ڕوونى د سەلوێ دە ل بەر پـەنـجـەر
( فـــعـــيـــنـــاهـــا كـــجـــمـــريـــن ويـاقوت وكالدر
وخـــداهـــا كـــتـــفـــاح تـــضـــاهـــي ظـبـيـة الـبـر
وســاقــاهــا كـــغـــزلان وأســـمـــاك مـــن البحـر
وريـحـهـا كـــريـــحـــان تـــفـــوح لـــيـــلـــة القـدر )
دەمـــا دانـــى ل ســـەر نـۆقێ دو سەد مرجانێ سۆر وزەر
دو ســـەد مـرجان ل سەر بـەژنێ د بورجا زەهرەئێ من دى
دبـــووم مـــەدهـــووش ژ نيشانا شەمال وعـوود ويەك فندى
پـــەيـــا پـــەى تێن سەمائێ دە د گەل وێ پەريێ گـۆڤەندى
صـفـەت حـــوورى پـــەرى ذاتـه دەلا وگەور وپورٍ ڕندى
چ ئـــەز بـێـژم ژ ئـــەوصافا نەما حوب قەط ژ دل بێت دەر
( لـــقـــد لامـــونـــي فـــي الـحـب كـأني مثل ذباب
جـــرت دمـــع مـــن الـعـيـن في أرضـها كـدولاب
ســـمـــونـــي مـهـجـور العشق فـكـان لـي مــن أسـباب
بـــهـــا صـــرت مـــفـــتـــشـــاً دلائـــل ومـــنـــجـــاب )
مـا وەك تـــە قـەط هەبت جارەك ژ داغان ڕا ببت سەروەر

بـــبـــت سەروەر سەحەر ئیرۆ مە سەر ئاڤێت دو سەد ئەفغان
دبـم بـولـبـول د ناڤ بـوغچە دەما گول تێت ل بەر رضوان
مـە دەست ئاڤێت ژ بۆ بیێهنیێ ل دەست دانین دو سەد خاران
فـەقـەط هـاتـن تـەداوی کـن کـو حوور وپەری وولـدان
ب پـــەریـــان ڕە گـەلـەك هاتن ل سەر چاڤێ نەذیر بێن هەر

( ١٧ )

# دلبەر گەردەن شەمال

دلـــبـــەر گـــەردەن شەمال مـحـرابـیٚ دە بوویە ظوهوور
مـــە نـــەظـــەر دایـــە جـــەمـــال بـــەژن وبالاییٚ ب نوور
خـــەجـــلـــم ئـــەز ویٚ ژ بـەر قامـەت وبەژنا تە لـەطیف
نـازکـا شـــۆخ وشـــەپـال ئـــەز عـاشقیٚ دێمیٚ ب نوور
ســـووســـن وســونـبول دبارن سەرخوەش وسوکران دبـم
ویٚ دبـارن هـــەر ژ لـــێـــڤـــیٚ عـەنبەر ومسك وکافوور
مـــا گـــەلـــۆ فـــەنـــنـــەر د قـەنـدیلە دەما ظاهر دبت
ئـــەو وەیـــە بـــەرقـیٚ ڤـەدابوو وەك تەجەللایە ل طوور
ئـــەوە تـــەمـــشـــیـــلـــە د بـــەرقـیٚ کو ڤەدا لامعەکیٚ
جـــەگـــەر ودل دبـورشـتـن کو د بەر چەشمان ( تدور )
مـــە گـــۆ رەوحـــانـــیٚ د بـەر ئاڤێتە دل عشقا غەدار
عاشق ومەعشووق یەکن پورس مەکە ژ ڤا بەحـشـیٚ کوور
بـــەس بـــکـــە جـــەوریٚ ل مـــن پادشەهیٚ تو ل جهان
مـا رجـــووکـار مـــە هـەیـە هیڤی مە ما ڕەببیٚ غەفوور
ئـاه ژ بـــەر جـــەور وجـــەفـائیٚ دلبەریٚ دل کر پوورونگ
روایـــەت کـــافـــی نـــەهـــن ئاهـیٚ ژ بەر خالێن دهوور
شـــەووشـــیـــن ئـــەم د قـیـامیٚ مە نەظەر حوسنیٚ دکر
( خـــدهـــا بـــدر مـــنـــیـــر ، وجـــهـــهـــا جام طهور )
( یا حـبـیـبـي ) چ بـــکـــم تـــە سینە کر ئامانـجـیٚ تـیـر
ئـــەی نـــەذیـــر دیـسـا دنالی ئاه ژ بەر ئەهلیٚ فوجوور

(١٨)

## ئاھ ژ بەر قەھر وجەفا

ئاھ ژ بەر قەھر وجەفا     دلبەر ژ دوور خویا دەکر
ھاتی د مەروە وصەفا     عشقا ل من پورِ زێدە کر

زێدە دبوو حوبب وئەڤین     پەیدا دبوو سێ سەد برین
جەرگ وھناڤ من بوونە خوین     جاما دلێ من پارە کر

کوشتم ب دەربا خەنجەران     وێ دلبەرا بەر پەنجەران
ھەوار ژ ظولما ئەسمەران     من ئەی ژ بەر ئەمانە کر

ئەلیف د قیامێ ئەوە     دالە قوعوودێ دە ئەوە
میمە سوجوودێ دە ئەوە     بێ صەوت مە سەر پەروانە کر

حسسا ب بولبول دین کرم     ڕوو گول گەشا بێ ھش کرم
ب وان سووسنا مەھجوور کرم     مەھجوور ب باغا شا نەکر

کوشتی ل بەر باغان ئەزم     ئامانجێ وان رمزان ئەزم
حەیرانێ وان حەرفان ئەزم     نیڤا گولا سەیرانە کر

سەیرانا وان چاڤێ بەلەك یێ نازكا شوبهەت مەلەك
كوشتنە وێ داهی گەلەك دەردێ ل وان شەفا نەكر

ئەی دلبەرێ رەحمێ بكە خەملێ ژ زێڕێ زەر بكە
بولبلی ڕاسەر گول بكە دەردێ نەذیر غەددارە كر

( ١٩ )

## دلبەر ژ بورجێ هات خوار

دلبەر ژ بورجێ هات خوار وەقتێ کو بوویە بهار
گولك وریشێ چوونە بەر وی ژ قەهرا من هەوار

گولكێ ل بەژنێ هوورن قەنج وپیس من قەبوولن
طەواف بكم یێ دورین خودا ژ بۆ من غەفار

ئەز چوومێ دە هەر ب زۆر طەوافا ئەنیا ب مۆر
مری کو ڕابن ژ گۆڕ ژ حوسنێ وێ ببن عار

حوسنا دلبەر گەلەکا طەوافا چاڤ بەلەکا
چێتر ژ یا گەلەکا ل سەر گوها بن گوهار

هەبوون خالێ ڕە شووقەر ل سەر وێ ئەنیا کەڤەر
دەڤ ولێڤ من دانین سەر جییێ لێڤان دبوو حار

حار هەبی بارد چیە ئەصلێ دلبەر سپییە
خەطەك ل سەر دانییە من ڤەخوار بووم عاقلدار

وەختێ عاقل کو نەبێ چقاسی حوب زێدە بێ
دەرێ دەحلێ ناڤەبێ وێ بەغچەیا هەر بهار

نـــێـــرگـــز تـــو پـــورٍ جوانیٚ        کـــەرەم کـــــە وەر ژ بـــانـــیٚ
پـــــەردە ژ بــــــەر هـــــلانـــیٚ        هـــا وەخـــتـــە بـــبـــیٚ ئـــێـــڤار

پـــەل وی ل بـــــەر پەردە بوون        وەکـیٚ باغ وبـەغـچـە بـوون
شەکر وشەربەت لـیٚ هەبوون        نـــەذیـــر تـاسەك ژیٚ ڤەخوار

## ( ٢٠ )

# زانم كو دل وجەرگێ تە

زانـم كـو دل وجـەرگـێ تە خوون خوار          چـــمـــكـى بوويە هەوار
طـالع مـــە فـەلــەك نـوو بـوويە دەووار          زانـــێ تــــو بـــريـندار

ئـەنـجـامـا تـــە مـەريـخ زوحـەل دهاتن          شـــێـــريــــنــــە وەلاتن
پـــەروازێ چ كـت ئـيـرۆ دو سـەد جار          لـــەو مـــايــە ل بەروار

گـــەل وان يـــەك مـوراد نەبوويە حاصل          چــەنــدا ئـــەون مـائل
هـــوون گـــازكـتـن بـەكـر شـێـــوردار          بـــۆ حـەبـيـبـا ڕەشـمـار

هـــەر وەخـت خـەبـەرێ سەياس دگۆتن          دل وجـانـــێ مـە سـۆتن
زيـــنـــدانێ دە يەك خۆرتێ دا خوونـخوار          بـــەكـــر دبـوو يەك جار

زانم ب حەقيقەت كو تويى ئيرۆ شەهيدى          مـــەيـــدانـــێ عـەگيدى
مـــەيـــدان ل رەخ وفـــيـــلا دبـوو سار          بـــەردانـــە تـە يـەك غار

يـــەك نـــوقـــطـــە وەكــى وا ل تە دانى          هـــەر كـەس ب تـە زانى
وەك بـــولـــبـــلــى تو صەوتى دكێ زار          گول دەركەت تو خەووار

چ نـــالـــيـن وفـغـانـن بـــێ حەسـێـبـن          هەر وەخت ب عەجێـبـن
داهـــى كـــو دبـێـژى تەڤ بين گوهدار          دائـــى نـــەذيـر غـــەددار

## ( ٢١ )

# بوغچەك هەبوو ژ بەغچان

بـوغـچـەك هـەبوو ژ بەغچان تـێـدە هــەنــە گــولـێ زەر
ســەد حەیف وسێ سەد ئەمان یـــەك جـاهـل ئەو هەڕت بەر

ب زۆر وهـــەم ب گـــازیـن ئـــەم ژێ گـــولا دخـــوازیـن
وەك بــولــبــولــێ قـەڤـازیـن شـــەڤ ورۆژێ دەیـــنـن سەر

شـــەڤ ورۆژێ دمـــــامـــــا دەوام دكـــــت نـــۆبـا مـا
گــــول ژێ ل بـــەر چـاڤا مـا تـێـمـە ب طـەعــن وئـەثــەر

ئـــەم مـــان ب نـال وئـەنیــن ژ دل نـــوو بـــوونـە حەزیـن
تـم دڤـێـت عـلـمـێ شێرین وا دڤـێـت گـائـێ قـەمـــەر

گـا وچـێـلـەك ب هـەڤ ڕە وا دڤـــێـــــتـــــن ژ دەورە
نـــابــێــژتــن ئـەڤ قـەبـرە تــێـــدە هـــەنـە سەد تەڤەر

داهـــی نــەكـــە تـو ژ بـیـر بـــبــێـــژە بـــۆنـا نـەذیـر
بـــەكــر گــۆتـی ژ بۆ مـیـر دڤــێ مـە یەك وەحش وكـەر

( ٢٢ )

## دلبەر مە دی ل بورجان

دلــبــەر مـــە دی ل بــورجان وەکی ڕۆژێ هاتە دەر
نەظەر مەدائێ ب چاڤان ڕەنگێ کەسك وسۆر وزەر
مـن گـازی کـر ب دەلالـی تـو وەر دا ئەز ببۆسم
زولـفـا ل بن چـیـچـەکـێ د گـەل وێ ئەنیا کەڤەر
د گـەل وێ من خەبەر دا مـەشها بۆ گوفت وکەنێ
وەر ئـــەم هــەڕن ســەمـائـێ بێهنا خوە ئەم بینن دەر
مـن گـۆ ئـەز پـوڕ دنـالـم دخـوازم یـەك طەوافێ
دەســـتـــوور بـــدە ژ لـوطـفـــێ ئـەزێ ببم ئەمربەر
وێ گـــۆتـــە مـن کـەرەم کە یا حەبیبێ پوڕ دەلال
طـــەواف بـکە تو بورهان د گەل برهان زەندێ زەر
ئـــەز دچـــوومـــە طـــەوافـــێ رەقـیب هاتە موقابل
بـــەکـــر د نـاڤ ئـنـسـانـا ژ دیـــوانـــێ کرم دەر
یـا رەب بـــکـــە حـــەقـیـقی عشقا د قەلبێ من دە
دا کـو هـــەڕم ئـەز ڤـەخۆم یەك تاس ژ ئاڤا کەوثەر
دا ئـــەم بـــچـــنـــە سـەمـائێ رەقصێ ژ دل هەژینن
ل گـــۆڤـــەنـــدێ ڕەشـینن کافوور ومسك وعەنبەر
دلـێ مـــە پـــوڕ حـــەی دبت ب ڤان دەرمانێ تازە
دزانـــم کـــو ژ دل بـــوو طـــەوفا ئەسوەد حەجەر

پـــەری هـاتـن طـەوافیێ شەڤ ورۆژیێ ب هەڤ ڕە

باری ل وان خـوناڤ دە تـم ژ ویێ مـسـکـا ئەزفەر

داهـــی قـەستا وان دکر هوون وەرین لـەعبا حەلال

ب یـەزدان سـووندیێ ددم ئەز ژ سەمائیێ نائێم دەر

( ٢٣ )

## من ل دونيائىَ ددیتن

مـــن ل دونـــيـــائـــىَ ددیـتـن كول د دل ده چوونه دەر
ئــەز ژ بـــەر وان پـورِ دنالـم ئەی دەلی دۆستا هەوار !
كـــو عـاشـق گـەلكىَ دەلال بوو دل ل بەر پەنجىَ غەدار
نـێـرگـــزێــن نـازك دەلالـــيـــن وا سـەمـا كرنه غوبار
مـــوصـيـبـەت تـێـنـه ل ســـەر مـه دائما وەقتىَ ئـێـڤار
( قـــد صـبـرت فـي الـمـصـائـبْ فاصـبـروا صبراً جميل
فـي الـمـصـائـبِ ربـحـتُ هـذا لـي فـضـــل جـزيـل
صـبّـهـــا الله عـــلـــيـنـــا وعـــلـــى الـعبد الرحيل
بـــهـــا صـــار فـــي الـداريـن حاكماً في سلسبيل )
دىَ چ بت حـالـىَ مه ئـيـرۆ دل وجەرگا خوون دخوار
مـــن دگـــۆ ئـــەز پـــورِ دنـالـم یا حەبیبىَ پورِ دەلال
تـــو بـــنـــێـــرِه هـــەر ل مـن مـن ناڤىَ ئەڤ دونیا ومال
مـــن دڤـــىَ دەر بـا غ وبوستان نەظەرەك صاحب جەمال
دلبـــەرا مـــثـــلـــىَ قـــەمـــەر ئـەو نازكا شۆخ وشەپال
گـــەردەن ودێـمىَ ب ئەلماس برە وزەندەك ( ذو الفقار )
( قـــد ســـألـــتـــك سؤالاً فاستجب لـي يا حـبـيـب
أحـــرقـــتْ قـــلـــبـي بـــرمـــز فـي الـصباح عندليب
نـــظـــر الـشـمـس إليّ لـــيـــلـــة الـقـــدر أديب
قـــد رأيـتــهـــا جـــمـــالاً أحـسـن البدر مـجـيـب )
وىَ ددا دەستىَ مه جامەك من ژ وىَ شـەربـەت ڤەخوار

شــــەربـــــەتـــێ ذەوقـــەك ل دل دا بـێهنا باغێ جەننەتێ
دەوقـــەيـــا دل پـــورٍ شرين بوو لـەورا كەتـمـا خدمەتێ
مـــن دگـــۆ زەمــــزەم بــــلا بــوو دەر ديارێ قوبلـەتێ
كەعبە وئەسوەد حەجەر بوون بوون مـەقامێ حوجەتێ
ڤـــێ بــەيـانـــێ ئـــەز بـەيان كم مە جەواب كر ئختيار
( اخـــتـــيـــاري فـــي الـبـيـان إنـــهـــا نـــجـم الـبـديع
اقـــتـــســـمـــتـــهـــا صـبـاحـاً فـي السماع بـالـتـنـويـع
اقـــتـــبـــســـت بـــنـــورهـــا درجـــــاً مـــــن الـرفـيـع
فـــي الـــــدرجـــات ارتـــفـــعـــت أفضل من الـجميع )
كــــــەس نـــــزانـــت ب تـــە داهـی كو نەذير ما ل ديار

( ٢٤ )

# نازكەك شيرين كەلام

نــازكــەك شــيــريــن كەلام صوبهى دهاتى خوەش ب لـەز

مــەجــنــوون د عشقى دە مودام دائم دخوازت ئەو هەوەز

ما دامە ئەز ئەبــجــەد تنى سەد موعەمــما بت يەك كەلام

عــارف تو نــيــنــە قەط وقەط تەصريح وتەفصيل بدنە ئەز

تــەصــريح وئــحــســان وپــەرى وەقــتــى عەرەفاتان دڤيت

قــوربانا عيدى سەر حەجەر هەردەم ژ نوو ئەو بەز ب بەز

قاز وپــەرى ئــەو رەف ب رەف ئيرۆ ل بەر دجلە مە دين

شــەعــلــوول وبــولــبــول تــينە دۆر دائم ل بورجا وامە ئەز

بــولــبــول د عــشــقــى سەييرين بوستان وبوغچە دانە هەڤ

يەك بشكووەك گول وى ددين پەروانى رضوان بوومە ئەز

ئــيــرۆ د بـــورجــا عـــەقــرەبى دە تين سەمائى سەد پەرى

ســالــەك د عــشــقــى تــازە بەست لبسى ل بەر چاڤايە قەز

يا رەب ئەڤــيــن پور زەحمەتە من واصلى مەحبووب بكت

پــورســى نەكن عشقا نەذير داهى حەلاندى جەرگ وبەز

( ٢٥ )

# تو نازك خوەش وەرە جان

تــو نازك خــوەش وەرە جان ل بــەر چاڤــی مە یەك جار بەس
بنیرین ئەم ل وان بورجان کولــی دل ئــەو دو ســی ژار بەس
کــەڤــۆك ونــیــرگــز وچیچەك ل بوغچان ئەم کەتن چەرخی
ســەرا ومــەســکــەن ودلــخواز ب یەك تەختۆر وبەیتار بەس
ئــەگــەر بیت صــوورەتی حوسنی صەحیفە سەطرە ثالث دە
دڤــی ئــەو من د مەعنائی بەلــی ئــەمــا ب هــەووار بەس
دل ومــیــلاك ژ نـــوو چـــوونــە ب دەربا فــغــانــی شەوقی
ئەگەر ئەو بــیــتــە مەیدانی ژ ڤی تــەقــصــیــر وزنــجــار بەس
د تــەقــصــیــرا دل وجان دە دبـــووم ئــیــســیــری سەیوانی
صەباح لەر دەرکەتی نەقشەك د رۆژا جومعە ئــیــڤــار بــەس
حــەقــیــقــەت مـــن نەظەر دائی دزانــم روهنی بوو ئــظــهــار
ل ســـەر تــەخــتــی وەزیر وشاه ژ تاج وفولکی دەووار بەس
جـــودا بـــوون ژەڤ رح وقــالــب د عشقا بولبول وگول دە
د نــەظــمــا نـــووبـــهــار دیــســا تەنی عشقا مە غەددار بەس
د مــەعــنــا نــەظــم وعــشــقــی دە مــەلائــك تــیــنــە دیداری
د بـــورجــا عـــەقــرەبی دەرکەت ژ خەوفا مە ژ دیدار بەس
ژ دیـــدارە تـــە شــیــریــنــی مــەلا مــەدهــووش دبــووم دائم
مــە جەوهەر عونصرەك خامس شەب ورۆزی ژ غوبار بەس
بـــەرات ولــەیلــەتــولقەدری ب چەشمان دانە هەڤ مزگین
فــەصــیــل وصەف ددیت داهی نەذیر ئەمــما ب هشیار بەس

( ٢٦ )

# ژ دەنگی دلبەرەك تازە

ژ دەنـگـی دلـــبـــەرەك تـازە ل مـن باطن بوو خوونە رەش
شـــەفەق دابوو ل ناڤ زازە بلا بت ئەو ب لـەز وەر خوەش
نـــە ریـزانـم هـــەرم نـك وی بـبـۆسـم ئەز ب شوجاعەت
هـــجـــووم دائـی ب ریـزانی ژ لـەو مام سەرییەك بی لـەش
مە ئاهـیـن چوون د سالـی دا فەلـەك دلبەر بوو ئەز كوشتم
ژ مـیـژ ئـــەڤ بـوو د دل وی دە نەدا من بەیعەكی بی غەش
مە جان سۆتی د وی ری دا نە دی من یەك طەبیب بۆ خـوە
ل بـــەر پـــەنـجـا ئـەزی مامە وە نازك روو نەدا گول گەش
تـــە ســـۆتـــن پـــور دل وجانا دزانـــی تـــو بـــریـنـدارم
تـــەمـام بوونە ل من سی سال نە من دی بیهنەیەك تا خوەش
دنـــیـــرم ئـــەز د بـــوسـتـانـــی شەب ورۆژی نەظەردارم
ل بـابـی وا ئـــەزی مـامـە وە نـائـــی سـاقـیـەك تـم خوەش
مـــە ساقی چـوون ژ دونیائـی ل عـەبدا ئەو كو گوهدار بن
دخـــوازم دەرســـەیـەك حـكمەت ژ وی كتابە حاشی رەش
مـــە دەر بـــوو نـیـرگـز وگـول تیك بچینم ئەز ل بوستانی
شـەب ورۆژی بـنـیـرم لـی سـەمـائـی بـیـمە ئەبروو رەش
دڤـــی مـــن دەرسـەكی مەنطق قیاس كم ئەز ل وی حوسنی
لـوزووم نائـی مـونـافـاتـان دی چـاوا بـیت ئەوی هەرمەش
د قـبـلـی دە مە دی یەك جار تەناقوض هاتە سەر عەكسی
جـزاكـر ئـــەووەل وئـاخـر ل مـن وی هـاتی موشەووەش

د شـعـری ده شـاطـر بــوومه وەلاکن هاته سەر من ( لا )

ب نــەفـیـی دوورکرم ئیرۆ فەلـەك دیسا دبووم بەخت رەش

وەکـی سەربەست نەبم جارەك دی چاوا بیم حوضووری دە

کـەتـم حـەیـص و د بـەیـصی دە ب نال وئازارەك حەبەش

داهی جان دا ب ئەفـغـانـا کو دی بوو دلبەرەك رەنگـیـن

ل بـەر چـاڤـی نـەذیـر دانـیـن حەجەر ئانین سەمائی شەش

( ٢٧ )

## دلبەر سەمائی هاتە دەر

دلــبـــەر ســەمــائــی هـاتـــەدەر زولــف وذەوائـــب بـــوون رەقاص
مـــن روحـــی شــیـریـن دانـی سەر لـــەو ژی دل وجـان بـــوون قـصاص

داغـــیـن د دل نـای گـــــۆتـــنـــــی جـەرگ وهـــنـــاف سۆت مـن تنی
نـالـیـــن ددا ســـەر ڤـــــی دنـــی لەو تـــەڤ حـــەمـی بوونە بـەلاص

مـــن كـــول ژ حـــســابـــی دەرن حـــاشــی ژ ســـەر شـەرحـان هـەرن
ولـــدان ب پـــەریـــــان رە وەرن وەقـــتـــی بـیـتـن ( حـیـن مـناص )

دائــم ب ســـەعـی وجـــەهـــدە بـن بـــوغـــچـی بی خار گول تی هەبـن
بـــولـــبـول د عـــشـــقـی زیـدە بـن دەردی ل مـــن نـــابـــت خـــلاص

ســـەد عـــالـــمـی نـەحـوی هەبن كـــتـــابـــی شـــــەرعـی زیـدە بـن
وەضـــع ومـــونـــاضـــر تـی هـەبـن نـــیـــنـــە د ناڤ وا قـــەط غـەواص

مـــەنــطـــق ل ســـەر جاری دكـــر عـــەكـــس وتـــەناقـوض چی دكـر
حـوكـــمـــی قـــەضــایــا زیـدە كـر فـــكـــری ل مـن پـــی بـــوو رصاص

فــعـــلـــــى تـەنازوع هەر دخوەست		وەك جام ل سەر دەست بت ژ دەست
حــوكـمـى حەديـشـــى من دخوەست		بـــوومـــە شـەهـيد وەك ئەبـوولعاص

داهــى بــەســە ئـەڤ چـەند كەلام		( دائـــم عـــلـــيـــك الـــسـلام )
مـا قـــەى نــــەذيـــر نـــابـت نـيام		چـــەنـــدا وى ديـــتـن چـەند رەقاص

( ٢٨ )

## بەس بكوژە عاشق

بــەس بــكـوژە عاشق دو سی نەذرە فەرض
واجــبــە ســەر مە كو بدن سەجدە فەرض
جـانـی شــیــریــن ئــەز ددمــە ئــاگـری
پــەروانــە فــغـان هەر دكن ضەوئە فەرض
هــا هــەیـە صــەبر وسوكوونەك بی ویصال
پــەردە وحـجـاب كو هلین وەصلە فەرض
دانـیـنـە دل پـەنـجـە سـیــنـە كـر ئامانج
چــوونـە طــەوافـا حەجەری عومرە فەرض
ئــەو دی بـچـن وەقـتـی عەرەفات حوجاج
بــیـنــە صــەفـائـی تا ل وان سەعیە فەرض
زەنــدی سـپـی گــول وا د گەل دانە هـەڤ
ســەعــیــەكــرن وا دائــمـا مروە فـەرض
چ دی بــبــت وی بــبــیــنـم سـەحـەری
خەف ب خەف ئەو تینە سەما نوونە فـەرض
وەقــتــی طــەوافــی سـەحەری دلبەران
راگــرتــنــە دەسـتـی دوعا چورخە فەرض
فـەرضـە دبــت تــەوبــە ل نـك عاشقان
ســی مـاه د سـالـی بـری بت تەوبە فەرض
داهــی تــە ددا جــانــی نـەذیر پور ئەلـەم
ســەرخــوەش وسـوكـرانـە ومیخانە فەرض

( ٢٩ )

# دبن مەحفووظ ب خاران

دبن مەحفووظ ب خاران گول عەزیز نائی ل بەر چاڤ قەط
بـسـتـان مـن ددی یەك گول ل ناڤ بەغچە ژ نوو بوو بەط
چ قـاز وهـــەم چ ئـــۆردەك بـوون دەما هاتـن ب سەیرانی
گـــریـــدان چـیـچـەكی زولفان ل دۆرا دجلە وهەم شەط
دبـووم مـەهـجوور ب یەكجاری غەریب هاتی ب پەروانی
د نیڤ رەیـحان وسونبول دە وە عاشق كیشا بوو یەك خەط
د عــشــقــی مــوبـتـەلا ئـیـرۆ دبـت ئەخرەس ب زبانی
ب وەحـی ورەمـز وئـیشارەت ( علیها ) قاصدەك ( هبط )
ژ مـــەیـلا سـۆرگـولـی سووسن سەری دانی د وی ری دا
ل داهـــی هـــەر جـــەگـــەر سۆتن خەطا وگوناهین غەلـەط
نـــەذیـــر دل دا ب دیـــداری ل سـەر وان طاقی ئەبروویان
چ جـــەنـگ وقـەوس وسەرتیرین ل دیمی تازەیین ئەو خەط

( ٣٠ )

## دلبەرا من د سەمائی بی

دلبەرا من د سەمائی بی بفرۆش مە ژ نەقش وخەططــی دەلال چ حەظ
د دیــوانــی بـگــەری مــەی بفرۆش مە ژ وی شەربەتە سوئالی چ حەظ
گـــەر بـــدی جـــامــــەك تـــژی مـــســــك وكــافــوور بــرەشـــیــن
كــو بــبــن لــوقــمــانــی ئـــەو مــە ژ دەست شـۆخ وشــەپالــی چ حەظ
نـــیـــرگـــزا نـــازك وتـــەر ســـــەد قـــەداح مــەشــرووب ل دەست
پــی تـــەداوی كـــت ل دل مـــە مـــوومــا ب وی شــەمال چ حەظ
عـــەنـــــبـــــەر وكـــافـــوور ومـــســكــی برەشینن رۆز وشەب
ل نــاڤ بـــەغـچــە د ســەمــا مە ژ قــەمــحــی د وی غــربالــی چ حەظ
وەیـــە داهـــی تـــە دڤـــیـــت نـــیـــرگـــز وســونــبــول ژی دوتا
هـــەر نـــەذیـــر ئـــەو بــوو د دل مــە ژ فكرا د وی خیالــی چ حەظ

## ( ٣١ )

# یا رەب دنیرم ئەز

یـا رەب دنـــیـــرم ئـەز ل وان سوبـحان ژ ڤان نەقشی بەدیع
دل دانـــیــــنـــە بـــەر کـاشـــوان لـی دائـمـا وەقـتی رەبیع
روبـعـا جـەمـالە وی تـــەنـی دەرکەڤ ل دونیائی ب خەف
شـــەوقـــەك ژ بەر وی دی جهان شوعلە ل سەر نابت مەنیع
ئـــەبـــروو وطـــەوقـــی دلـــبەران کەشفن ل سەر زیروزەبەر
ئەو راست وچەپ لـی بوونە خەط دائم دخوازین ئەو رەفیع
( ســـورة الــفــتـح ) ی دخـوازم تم ژ بۆ هـەیـجا وجەنگ
دا بـبـت مـــەنـصـووری ئەز رووحەك ل من ئەو بت وەدیع
نـاصـر ومـــەنـصـوور وەریـــن یـــەك یەك ببیژن ( الوداع )
دەســت دانـیـنـە مـوصـافـحـە دەمـع ل چاڤ بوونە نەبیع
وان ئەز دبـم مـــوصـــافـــحـە یـەك خـەط بکیشم بۆنا دل
پـــور ئـــەز ب سـەعی وجەهدەییم نابت مەکانی من وەسیع
نـابـت خـــلاص ئـاهـــی دنـــی حـەتتا کو دل قەنـجی بکت
ســـەد عـەسـکـەری سەیـیـار ئەون رم دانینە شوبهی جەدیع
داهـــی سـەیـیـار ئازا بکە ئـیـسـیـر نـــەبـت شـوبهی نەذیر
هـەیـجـائـــی دە ظـاهـر ببت دل خوونیی سی سەد وەکیع

( ٣٢ )

# دل دبوو پیت وپورونگ

دل دبــوو پیــت وپــوررونـگ ئــیــرۆ ژ بــەر هەواری داغ
دانــیــن کــەبەك سی سەد تڤنگ ئیخستە دل سەد جاری داغ
حــاکــم دڤــی عــادل بــتــن حــوکــم ووەظـیـفـەت زیدە بت
دائم دسۆت جەرگ وجەگەر وی هەر ژ بەر مەی جاری داغ
وەی کــو ل مــیـــلاکــی کــەڤت تیر ورمی دەست دلبەری
پـــەنـــجــە د نــیـڤــا دل دکت وەك بولبولـی گولزاری داغ
یـاری ل مــن دانـیـن خـەدەنـگ ئـیـڤـار وصوبح ورۆژا عید
نـارەك دلـی مــن سـوهـتـیـیـە هەڤتی کولـی دژواری داغ
کــی دی بـــبـــت تـەخـتـۆری داغ داغین دلا دەرمان بکت
ســەد شــیــشــە وجامی زوجاج تا پی دەرت گولناری داغ
تــەشــریــف ولـوطـفـا دلـبـەری تەشبیهی جوودا حاتەمە
پـوشـتـی ئـەوان کـەلـهـی تـەمام ئاڤیهتە دل سەد یاری داغ
ســەد رسـتـم وئـیـمـام عەلـی مەیدان ژ خوونی رەش کرن
حــەمــزە وخــالـــد تـا ل وان خستـن د دل بزماری داغ
دائـم عــەگــیــد وفـیـرسـان روح دانین سەر نوورا بەصەر
داهــی وەکــی وان دا فــغــان دانـیـن نەذیر سوواری داغ

( ٣٣ )

# من دی سەحەر شیرین دهات

مـــن دی ســەحـــەر شـیــرین دهات
مـەکـتـووب ل ســـەر دەستانە لـەف

صـــەبـــر وخـــەیـــالا مـن خـەلات
مـــن ســـەر ددانـــی سـەد ئـەسەف

ئـــیـــرۆ کـــەلام شـــیـــریـن ئـــەوە
گـەردەن ب نوور خوی زولـف ئەوە

لـــەیـــلا د عـــشـــقـــی مـن ئـەوە
ئـــەصـلان ب مسك ددان صەدەف

گـــول پـــەری‌یـان تـــیـــتـە ســەما
ئـــەو مـــن د عـــشـــقـی پور غـەما

تـــیـــنـــە ســـەمـــــا دەم ب دەمـا
جەنگ و ب عـوود ساز و ب دەف

ئـــیـــرۆ ســـەحــــــەر دلبـەر ددی
نـــیـــڤ بـەغـچـەیـا گول وی ددی

بـــولـــبـول ژی قـــەط نـاکـت فدی
لـەو کـــو ددی جـــۆتـــی غـەدەف

جـــۆتـــی غـــولام وســـونـــبـــولان
عـــوقـاص وفـەرع تـیـن سـەر ملان

حـــــوبـــــا ل وان دابـــــوو دلان
جـان مـــن د بـــــەیعی دا سەلـەف

داهـــی تـــە دی حـــــوبـــب وئەڤین
جان وجـــەگـــەر تـــەڤ بـوو برین

نـــەذیـــر تـە دل هـەر بـوویە خوین
مـــەوج و ب مـەوج تی دەر بکەف

( ٣٤ )

# نازكا من ب دەلالی

نـازكـا مـن ب دەلالــی هەر وهەر بوویە صەدیق

وی ل پـەی مۆم وشەمالــی عشقا من مایە حەقیق

سـەجدەیەك صافی دبـم د دلــی ئـاتـەشی عوود

نوون ومـحـرابـی د قـبـلی كەبەدی كرنە دەقیق

گەردەن ودیمی ب نوور ( حرقت قبلـي ) ل سەر

( كل مـن ینظرهـن ) جەگەر دانە مەنـجـەنـیـق

مـاه وئـەیـیـامـی د سـالــی بی فەیدە عومر برین

ما گـەلـۆ ( یـرجـع الـماضي ) ببینم زیر ورەحیق

مـە ب دل صافـی دڤێت یەك موغنی ونایی ل پەی

جـەنـگ وقەوسن د سەمائی پەریان دا ب حەقیق

د ســـەمـــائـــی دلـــبـەران راگرتـنە دەستی دوعا

ئامـیـن ئامـیـن دكرن بو عەبەیدی بەحری عەمیق

چ عەبید و چ غـولام ئەڤ چ سەبیح وچ غەواص

ئـەڤ چ مـەوج و چ گرن راكرنە وا یەك غەریق

لــەذذەت وذەوقـا د دل تـــە دڤـیـت داهی نەذیر

فـكـر وئـەفـكـاری بـەلاڤن نیڤا بوستان وحەدیق

## ( ٣٥ )
# مه خالد ( ذي الجناحين ) دى

مه خالد ( ذي الـجـناحين ) دى تەبارەك
مه بـۆسن ئـەو دەسـت وپـايـى مـوبارەك
نەهشيار بووم بـەلـى ئـەمـمـا فـوجائەت
مــە دى هـاتـى كـو ئـەو ذاتـى موبارەك
دەمـا هـاتـى دو سـى فنجان د دەست دا
ڤـەخـوارى مـن مـــەى وئـاڤـا مـــوبارەك
ساعەت هـەفـت وئەوى نيڤەك شەڤى بوو
ل مـــن دەسـت و وە پا بـوونـە مـوبارەك
( فــقـــال قـــم ألا يـا أيــهـا الـعـاشـق
تــصــيـــر مـــن كـــل الــنـاس مـبارك
أنـا قـــلـــت فـــأعـــفـــونـــي يا سيد )
دزانـــم ئـــەز تويـى هەر وەخت موبارەك
( فــقـــال يـــا نـــذيـــر اقـعـد مكانك )
بـــدە شـــوكـــرى خودائى خوە موبارەك

( ٣٦ )

# من دیتبوو پوشتی عەشا

من دیـتـبـوو پـــوشـتـی عەشا دلـبەرەك

وی ددابوو دەستی مـە جان دەفـتــەرەك

شــەووشـیــن ئەم د سوننەتی لـەحظەكی

پـــوشـتـی روكووعی دخوازن خەبەرەك

شەرط وعلامی طەوافـی  دخـــوەسـتـن

نـــیــنــە جـەواب ئەم ددنی مەهدەرەك

شــــۆخ وشـــەپـــال ونـــازك ونـــازەنـیـن

من دیـــتــبـــوو نـیڤا سەما جەوهەرەك

داهی تە دی شەوقەك ل بەر سونـنــەتی

دانی نەذیر نیڤا فەرضـــی خەنـجـەرەك

( ٣٧ )

# زانم ته دڤيتن تو ببۆسى

زانــم ته دڤيتــن تو ببۆسى پور خەط وخال — يــەك جارى ل بــەر ئال
يەك راحەته ئەرواحى دڤيتــن ئەو ببت عال — لــى فالە حەرفەك دال
هەر وەختى دڤـيت ئاڤا حەياتى ته ژ بۆ دل — نــائـــى ب تــەنــى مــل
وەك ئەسكەندەرى خوەش هاتى ل بەر مال — زەنـــدا وى دبـــوو ئال
كـــەس وەك وى ل دونـــيـــائـى نــەگەريا — ب دل شەوتى ڤەگەريا
يـــەك عـــاشـق جـــەزيـرى دە كەتى چال — ئسمەك بـوو مەمى ئال
داهـــى ل تـــە هـات عـشـقـا وەكى وان — دل وجـان تـە حـەليان
( مـــن غـفـلـة ) د قـەبـرى تو بچت بال — هـنـگـى گـهـت ئامال
نالـيـن نـــەدا هـــەر وەخـــتـــى ب زارى — نـــە فـغـان وهـەوارى
خـوەسـتـى نەذير يەك فنجان ژ يى زەلال — لــى بـــوويە كەر ولال

( ٣٨ )

# مه دلبەر دی ل بەر سەیحان

مــه دلـــبـــەر دی ل بـەر ســەیـحـان فــەلــەك دیـسـا برینداریم
هـشـیـن بـــوویـــه وەكی رەیـحـان ل سـەر شـەوقی ب زارزارم
ل بەر شەوقی مە صەرف خوەندی مە دی ئعراب ل سەر لەفظـــی
سـوكـوون هـات سـەر حەرەكـاتـی ب دل جـــەزم وضەم وژارم
دبـــووم مـــەفـــعـــوول د نـــەحـوی دا تـەنازوع هاتە سەر فعلی
ب وی فـعـلی ئـــەزم مـەنـصـووب شـەڤ ورۆژی ب ئیـخبارم
ئـــەزم مـــەنـصـــووب ب وی فـعـلی دەما زەید بوو ل من فاعل
عـــەمـــر ئـــیـــرۆ دچـــوو حــــەذفــی د نائـــب دە بـریـنـدارم
دەلـــیـــل بـــیـــنـــم ژ مـــەنـاظـــر د سـی بـورهان ژ مەنطق بت
مـــوفـــەصـــصـــەل كـم ب وان جـنسا ب فەرد ونەوعی قنطارم
ب زەوج وفـــەردەیـــەك فـــەصـــلـــی ئـــەزم ماهـر ب بورهانی
دبـــــووم مـــــوفـــــرەد قـــیـــاســـی دە شـــەب ورۆژی فكردارم
چ ئـــســـتـــعـــار كـــەتـی بەندی حـمـامـی دە ئـەسەد بیت دەر
ب لـــەفـــظ ومـــــەعـــنـــەیـــەك تـازە ل تـەشـبـیـهەك پلندارم
ژ بـــەیـــانـــی جـــەواب ثانی مـە جاری كر ل سەر تـەفـسـیـر
ب حـوكـمـی حـەرفـەیـەك عەطـفـــی د وی سطری موستەعارم
مـــوهـــەددەر بـــووم د شـــەرعـــی دە دبووم مەقتوولـی مابەینی
عـــەقـائـــد بـــۆ مــــە نـائـــی قـەط ژ وەصـفـان ئەز خەبەردارم

شـــەڤ ورۆژی دخـــويـــنـــم ئـــەز نـــەدی فتوەك ژ بۆنا خوە

د تـــەفـــســيـــر وقـــاعـــدا دە مـــوحـــەددثـكـى ژ بـــەروارم

حـــوكـــم كـــريـــە ب حـــەديـشـــى گەلۆ ما قەى رياض كانى

ب داهـــى دى ددو فـــەتـــوا ب وان فـــەتـــوا نـــوو ئەبصارم

بـــدە مـــن فـــتـــوەيـــەك تـازە ژ مـنـهاجى وە مەنهەج بت

بـــبـــم ســـەربـــەســـت عـــولـوومـا دە نەذير نووڤە حوكمدارم

( ٣٩ )

## من ژ بەر نال وفغان

مــن ژ بــەر نــال وفــغــان دل دبــوويــە دەم وخــويــن
دی چ كـم ئـيـرۆ ژ بـەر وان ئـاخـڤـنـا نـوو بـريـن
مــن دڤــی كــو ئــەز ببـيـنـم خال وديـمـی ئـەنوەرين
زولــف وبــســكـی دلبـەری ئیرۆ ل دیـمـی عـەددلـیـن
كــەمــبــەر وطــەوقـی ل پوشتی ئەو ل بەژنی سـەیـیـرین
وەصــفــی وی كــو ئـەز ببـیـژم دائـمـا نـابـن تــەمـام
رەمــز وتـیـریـژی ل دل دا ئـەز ژ بــەر وەجـلـی رەڤام
مــن نــەظــەر دایــە ل چـاڤـان خـەط ل قـەوسـی ئنتظام
( أحـسـن الله تـبـارك ) چــیــكــری بــەدرەك تــەمـام
یـەك ب یـەك سـونـبـول دبارن ئەو ب سەر مل دە خورین
دخــوریــن زولــفــی سـیـاه ئەو هەر ل سەر بەژنا زراڤ
ســووســن وتـایـی حـەریـری ئـەو د ناڤ وان بوونە راڤ
دەرمـانـی دەردی عــەلـیـلا وی شـەفـەق دا تـم د نـاڤ
وی رەشـانـدی هـەر ل سـەر وان عەنبەر ومسك وگولاڤ
ئـەم دبــن ســوكــران ژ بـیـهنا مە د دل دە غەم جەڤـیـن
بــیــهــنـا خوەش كەسكی نـەدی ئـیـرۆ زەمانا قەط وقەط
نــەقــش ونــیــشــانــی جـەمـالـی نینە تیدا یەك غەلـەط
وی نقیسی نوون د گەل میم راست وچەپ لـی بوونە خەط
دجــلــە وئــاڤــا مــورادی مــەسـكـەنی تـم قاز وبەط
پــیــل وگــەر هـاتـن ب سەر مە ئەم د ناڤ دە خەنقـیـن

دلـــبـــەرا مـــن پـــور دەلالە مـەصـنـووعـە رەبـبـی قەدیر
وەجـــهـــی وی جـامـا زەلالــە حـاشـا نـیـنـە کەس نەظیـر
لامـــعـــەك هــاتـــی ژ بــــالا ئـــەمـــر وفـەرمـانـا ئـەمیـر
گـــۆ : ســـەحـــەر داهـــی بـــنـالـە هەر تویی ئیرۆ ئەسیر
ئـــی تـــەنـــی تـــەنـهـا دنـالـی ئـــەو نـــەذیـری دلـبـریـن

( ٤٠ )

# دلبەر ل من عشقا تە

دلــبــەر ل مـن عـشـقا تە      وەكـی عـشـقـا مەم وزين
كەت پـيـشـيـا من فەراتە      جەگەر ل من دبـوو خوين

ئـيـلاهـی ئـەز گـــەدامـە      وەك عـــەبـــدەكی ئازا مە
ل دەرگـاهـی تـــە مـامـــە      دائـم ب قـيـرين وشـيـن

تـازە كـولـی مـن دەر بی      ( جـاء دم مـن قــلـبـي )
ل ســـەر كـتـابـی وەر بی      نـە كـو ئەم وی دخوازين

وەلـــلاهـــی ئـەز دنـالـم      نەخوەش وهەم بی حـالـم
ضەعـيـفـم وەك عەبدالـم      بـۆ مـن ئەوە گولا شـيـن

مـن گول هەبوو ژ بوغچان      نـەظەر مە دائی ب چاڤان
مـەدهـووش وبی عاقل مان      نـــووڤـە ژ دل دنـالـيـن

گـەلـۆ قەی وی چاوا بـی      كـو ئــەز نـەدم جەوابی
حـــەتـا قـــيـامـەت رابـی      مەكـتـووب ژ نوو ببارين

دەما بارین مەکتووبە    حەبب گهت مەحبووبە
طالب گهت مەطلووبە    هیڤی ( رب العالمین )

( قد جاءني شوق لك )    ( بعثتني ) شوعلەیەك
نەذیر دبی ئەی فەلەك    کەنگی ئەم وی بگرین

( ٤١ )

# مه سۆزەك د گەل تە هەیە

مــە ســۆزەك د گــەل تــە هـەیـە ئەلئەمان

کــو چــووبــوو ژ تـە نـالـینـەك ئـاسـمـان

قــەســەم ئــەز دکـم هـەر ب ناڤى لـەطیف

تــو قــبــلــە دوعــائــى ژ بـۆ عــابــدان

دوعایەك قەبوول نابی ( إلا ) ب ناڤى شەریف

بــاوە کــە ژ مــن تــو ب صــدق وئیمان

مــە جــان دابوو رووحەك مایە سەر جەسەد

ب رۆژ و ب شــەڤ ئــەز دبـیـژم ئـەمـان

د گــەل تـە هەیە یەك خەبەر ( من ) ژ مـیـژ

بــپــورســە ل عـاهـد ب رەحـم وئـحسان

نــەهــیــژامــە ئــەز کـو نـەظەر کم ل تە

بــەلـى ئــەز دخــوازم بـیـمـە ئـاسـتـان

بــبــیــژە تــو داهــى بۆ باری بـحـوون

بــدە شــوور وەکــى فــیـرس وپەهلـەوان

نــەذیــر کـو دبـیـژی نەکن هوون ژ بـیـر

ئــەڤــان ضــەرب ودەرد وا غـەمـولئەمان

( ٤٢ )

# تعالى اللّه چ دلبەر بوو

( تـعـالـى اللّٰه ) چ دلبـەر بوو	مــە ديـبـوو ئـەو شـەڤـا ئينى
ددو فـنـجان ژ دەست دەربوو	ژ لـەو ئـەز هـەر دبـيـم ئـەينى

دخـوازم ئـــەز ژ وى جـارەك	بـدى مـــن ئـاڤـا مـــوبـارەك
شـفـا كـــت ئـــەو بـريندارەك	دبـووم مـەقـتـوولـى مابـەينى

ژ مـابـــەيـــنا دو چـەشـمـانـا	مــە دى تـيـريـــژ ژ ئاسـمـانا
دهـاتـى خـــوار ژ بـــورجـانـا	ل بـــەر چـــاڤـــى مه دا دەينى

كـو دەيـنـى ئـــەو ل مـەيدانى	ل دەر حـەق مـــە ب ئەرزانى
دزانـــم تـــو پـــەريـــشـــانـى	دبـــيـــنـم ئـەز ب وى زەينى

ژ وى زەيـنـا گـولا تـە گـەش	بـەلا كه بـيـهنا ته پور خوەش
ژ كـافـوورى ومـسـكـا رەش	نـەظـەر كـم دا ل وى بـەژنى

ژ گـول رەنگان نەقش زەر بـى	ل شـەرقـى كەت حەتا غەربى
ژ بـۆ شـەوقـەك د دل وەر بى	ل گـــۆڤـــەنـــد وسـەمائـەيـنى

سـەمـائـی پەری یەك لـی بـی　　ئەگەر سەد جار کرام چی بـی
نـەظـەر هەر وی ل بەژنی بـی　　ل ذات وهـەم ل وی عـەیـنـی

وە داهـــی پور نەظەر لـی کر　　دەمـا کـەمـبـەر ل پـوشتی کر
نـــەذیـــر دیـبـاج ل بـەژنی کر　　حـەلاوەت بـــوو ل دارەیـنـی

( ٤٣ )

## ل باغا دلبەرەك تازە

ل باغا دلبەرەك تازە        هەنە چیچەك گولی رەنگین
فەلەك دیسا چ جەمبازە        مە پور جەور وجەفا زۆر دین

مە پور جەور وجەفا كیشا        سەحەر نووڤە برین ئیشا
تو ناپورسی ل دەرویشا        دبوو عاشق ل تە مسكین

دل وجانی مە ئیشانا        تو نائیی مە ب سەیرانا
موصافەح كە ب دەستانا        بەلی ئیرۆ ئەزم غەمگین

ئەزم غەمگین د سالی دا        نالین چوو بوون ب ئەرضی دا
كو دلبەر بوو تیرەك لیدا        گەلۆ بینم وی رۆژا دین

د رۆژا حەشر ومیزانی        دخوازم ئەز ژی ئحسانی
بدی جوزئەك ل پەروانی        دنالم ئەز ژ بەر مەی دین

چ نیرگز بوو چ رەیحانا        چ چیچەك بوو ل بوستانا
ژ بۆ من هات ب میهڤانا        ژ لەو ئەز بووم حەقیقی دین

حـــەقـــيـــقـــى ديـــنـــى زيندانى　　كـــو فـــيـــل هـاتـە ل مـەيـدانى
بـــەكـــر شـــيـــورەك ددو دانـى　　ژ دۆســـتـــا دوورکـرى وى زين

مەمۆ هات مـيـر ب سـطـرنـجـە　　وى سى دەست ژى برن قەنـجـە
بـــەكـر هەر وەخت دبوو سينجە　　هـــەوار نـــووڤـــە گـهـا تاجدين

مـوراد گـەل وى نـەبـوو حاصـل　　د زيـــنـــدانـــى دبـــوو دلـكـول
داهـــى وەك وى دبـــوو مـائـــل　　نـــەذيـــر بـــوويـە شەهيدى دين

( ٤٤ )

# نیرگزین سونبول ل پەی وان

نــیــرگزین سونبول ل پەی وان مە ل چۆلان خوەش ددین
هــەر وەکــی ســووســن ل پایان دائــی خالــی رەش ددین
دل دبــت بــەحـــرا ل فـولکا مەوج وپیل وفەتل وگەر
درەشــیــنــن جــەگـــەری دە مــە ل بورجان شەش ددین
مە ل بورجی ئەســمــەران دی تین ســەمائی ســەد پــەری
حــوور وولــدانــی د غـــورفـا مـــە ل قەصرا مەش ددین
وی د قــەصــرا پــەری‌یان کافــوور وعەنبەر مسك وگول
تــیــکـلــی هـــەڤ کـــرنـا ئـالا ولـــواء رەش ددیـــن
هــەر دەما رەنگین مە دین هاتن تەماشا صەف ب صەف
لــەك ب لــەك تــیــنــە سەمائی سەد مەلائك لەش ددین
ســەد عـوشـاق هـاتـن تـەمـاشـا عاشـقی نوورا بەصەر
شــوعــلــەیـا نــوورها مونەززەهـ تیریژ تیریژ خوەش ددین
مـا دبت مـثـلـــی تە داهی سەد هەزار عـەبـدی فەقـیـر
ئـــەی نـــەذیـر نووڤە دزانت سی فنجان بی غەش ددین

## ( ٤٥ )

# دی چ کم ئەز

دی چ کـــم ئـــەز ڤـــی زەمـانـی صافـی نابت قەلبی‌یـە
وی مـــرن بـــیـرا خـــوە نـــانـــی ئەو د دونیا تالـی‌یـە

مـــن هـەبـوو مەحبووب دە ئیرۆ من د گـەل سیران دکر
مـن نـــەظـــەر دایـــە ل چـاڤان خـەط ل دیمی هندی‌یـە

زیـــر ل پـــەی نوونـی رەشاندی نەقش وصونعا قودرەتی
کـــو نـڤـیـسـی حی د نیڤ میم دال ل پەی وی دانی‌یـە

کـــی گـــەلـــۆ سـەر هـش دمـینی کو دبینی ئەبروویان
جام وفەرفووری ل بەر وی زولف د خەططـی لائـی‌یـە

چ دبـــت وی ئـــەز بـنـیـرم جـارەك ل بەژنا تە لـەطیف
بـیـم طـــەوافـا زولـف وخـال وئـسمی تەی نوورانی‌یە

کـو طـەواف کم پی ودەستان دا موبارەك بت فـەقـیـر
ئـەز بـنـۆشـــم مەی ژ جامـی عشق ببت تـم بـاقـی‌یـە

دی ل کوو ئەرضی گرم بەژنا وەکی رەیـحـان ب نوور
مـثـلـــی رۆژی بـت شـەفـەق بەغچە وناڤ رضوانی‌یە

بـەغـچەئی گول وی د ناڤ دە من ل دۆری چەرخ ددا
لامـــعـــەك هـاتـــی ژ بـــالا وی د نـاڤ دا دانـــی‌یـــە

مـن نـــەظـــەر دا لامـــعـی سوبـحان ژ شاهی قودرەتی
حوسن وجەمالە دلبەری جـەوهەر وعونصور عالـی‌یـە

عـونـصـری خـامـس مە دی ئـیـرۆ د بورجا زوهرەئی
عـەقـدا پـــەرویـــنـــیٚ د بـــەر دە ئـەو دبوون ئالائی‌یە

شەووشیـن ئەم هەر ژ بەر وان کو مە دین خال وزولـف
مەفـتـهـا قــەلـــبـــی عـەلـیـلا ئەو د بورجا شەمسیـیە
ئەز دبووم سوکران ژ بەر وان کی گەلۆ مەهدەر بکت
مەهدەرا وی شەوق ونووری ئەفضەلـی سەد حەجـیـیە
کـەس نـەمـا مـەهدەر بکت ئـیـرۆ ل حالـی تە ذەلیل
مـەلـجـەئـی عشق وعوشاقان ئەو رەببی تـم بـاقـیـیە
تـــو قـەبـوول کە یا رەب دوعایا عەبدی خوە فەقـیـر
کـو دنـالـی هـــەر زەمـــانـــا ئـــەو نەذیری داهـیـیـە

( ٤٦ )

## فەلەك مامە د قەیدی دە

فــەلــەك مــامــە د قــەیدی دە    دەمــا بــیــن ئــەو خــەط وخالە
جــەگــەر هوور بوو د عشقی دە    ژ دل چــوو بــوو دوســەد نالە

فــغــان ونــال ژ دل ئــاڤــیــت    ب شــیــریــنــی دەمــا ئــەو تــیت
د قــەلــبــی دە ئــاگــر بوو پیت    دەرمــان نــیــنــە بــۆ عــەبــدالــە

ئــەزم وەك گــۆك ل بەر ضەربــە    ل جــانــی مــە هــەرۆ حەربــە
تــو بــولــبــول سەر گولا زەر بە    د ناڤ بــەغــچــە دبــووم لالــە

فــەلــەك مــا قــەی تــو نەیاری    هــنــدی هــیــســتــر ژ چاڤ باری
تــو نــاپــورســی ژ بــرینداری    فــالــە وی حــەرفــەیــەك دالە

ب یــەك ساعەت دبووم عاشــق    مــە دل دائــی نــەبــوو لائــق
ل ســەر مــە ئــەو دبــت فائق    ئــەلــیــف نــائــی ژ بۆ فالە

مە جەوهەر عونصورەك نووری    بــنــۆشــم مەی ژ فەرفووری
ببم مەدهووش ل سەر طــووری    دەمــا دل تــەكــیــە وپــالــە

ل نــك دلــبــەر بــبــم قاعــد    ژ بــۆ ئــیــلاه بــبــم ساجــد
ســەحــەر ئــیرۆ بــبــم عابد    ژ دەنــگــی زنــگ وخــرخــالــە

ب دەنگی عوود وتەنبووری ب وان حەرفی د زەنبووری
مە دل بوو لامعا نووری ل بەر چاڤی مە بوو ئالە

هلاڤیت پەردە قەلبانە کو ئەو هاتی ژ ئەسمانە
ما چ بکم ئەز نە ریزانە نیشان من دیت ببت پالە

تو دەرمانی دل وجانی ( شکرا حمدا ) تو دزانی
تو هەر قبلە عوشاقانی سەعیە عومرە بوون هەڤالە

تە سۆتن پور دل وجانە ب وان شووری عەگیدانە
ل باغی سۆرگولا مانە کەتم زیندان وهەم چالە

ب رۆژ وشەڤ تەبات نائی وەکی مەجنوون ولەیلائی
ل مەهدەر قەط کەسەك نائی مە گۆ حەبسا وی هەر مالە

د حەبسی دە ئەزم دل کول دبم عاشق ل وی زەر گول
دنالم ئەز وەکی بولبول دل وجانی مە بوون تالە

دل وجانی مە پور سۆتن ب وەصلە غوربەتی نوهتن
فراق وغەفلە تیك جۆتن نەذیر ئیرۆ دبوو کالە

( ٤٧ )

# سەحەر ئیرۆ مە کر گازی

سەحەر ئیرۆ مە کر گازی    ژ دل چوو پیتەکی نارە
لامع هاتی ب پەروازی    ژ بالا ئەو هاتی خوارە

دەما هاتی ب پەروازی    ب بەز هاتی وەکی بازی
شەهید بوومە تویی غازی    ژ میلاکی بریندارە

دەما تین کەوکەب ولامع    ( مساء ) ئەو دبوون ساطع
فەلەك دائم دبوو مانع    عەزیز نووڤە شوکوردارە

ژ بۆ ئیلاه شوکوردار بوو    حیجابا قەلبا نوو رابوو
کو تیر ورم ل من دابوو    ب رۆز وشەب دە هەوارە

مە دی لامع د قەلبی دە    مەلەك سەیران کرن وی دە
ذەلیل بوومە د عشقی دە    عەلیل نەجما تە سەییارە

عەلیل بوومە ژ بەر داغا    مە جان بوو ئەو گولا باغا
وەرت سەربەست وەکی ئاغا    ب مەش بیت بیت ئەو د نزارە

شەفەق دابوو وەکی نووری    تەجەللا بوو ل سەر طووری
هشین بوویە ل بەر سووری    رەیحان شین بوون ل بەر وارە

ژ بـەر وارە صـەیـاد رابـــوون		رم وخـــەنـجـەر ل من دابـــوون
مـە ژی نـالـیـن ژ دل دابـــوون		چ نـــالــــیـــنـــکـــی ب دژوارە

مـــە دا ئـــەفـــغـان ب دژواری		ل مـــن روون بـــوو شـەڤا تاری
خوناڤ هەر وەخت ژ بەر باری		مـــەلائـــك تـــیـــنـــە گـوهدارە

ب حـەقـقـی وان نەبـیـیـا کی		ب ئەسـمـائـی نوو حـوسـنا کی
داهـــی ئـــیـــرۆ ب وا شـا کی		نـــەذیـــر مـــایـــە بـریـندارە

( ٤٨ )

# مه دلبەر دی د خەونی دە

مه دلبەر دی د خەونی دە　　سەحەر رەمزەك ل دل دایە
سووسن بوو ئەو نەسیم لیدە　　د مرئاتی دە خویایە

د مرئاتی خویائی بوو　　نە حۆری بوو نە پەری بوو
ئەبروو نەقشی ئیلاهی بوو　　د قبلی دە تەجەللایە

لەطیفا نازکا شەنگا　　ب بەژنی نیرگزا رەنگا
هەروهەر باهین ودەنگا　　ب قامەت رندە عەبلایە

وەکی عەنتەر ئەزم مەجرووح　　کو تیر ورم ل من دانە
وی ئەز کوشتم د عشقی دە　　کرم غەرقی ل پیلایە

بەسە داهی جەگەر ناری　　گول ورەیحان ل تە باری
ل سەر طووقی ب دژواری　　نەذیر نالین ژ دل دایە

( ٤٩ )

## ئەڤینا تە عەلیل سۆتن

ئـەڤـیـنـا تـە عـەلـیـل سۆتن　　دوتـا ژ زولـفـی تـە بـەردانە
ل نك دیـمـی چیچەك چووتن　　ژ بـۆ دەردی مـە دەرمـانـە

نـە تـەخـتـۆرە نـەطەبـیـبە　　نـە ئـەو دۆسـتـە نە رەقیـبە
نە رەیـحـانـە نـە ئـەو دیـبە　　دو گـول سۆری ناڤ بوغچانە

نـە حـۆری بـوو نە زیبا بوو　　نـە ئـەو خـاکە خوراسا بوو
ژ ئـەرضـا مـەککەهی رابوو　　بـۆنـا جـەرحـی مـە شـەفانە

عـەلـیـل بوومە ب دائی خـوە　　ذەلـیـل بوومە ب قەلبی خوە
ئەزی بـمـرم ب دەردی خـوە　　هـیـسـتـر چـاڤـا مـە رەوانە

( جـرت دمـع مـن العـیـن )　　ئـیـشـارەت دا ژ مـابـەینی
بـلا یـەك جـار سـەلام دەینی　　سـەلام کـاری عـوشـاقـانـە

ژ بـەر دیـمـی سـەلام دابوو　　پـەردا عـشـقی ل دل دابوو
ل دونـیـائـی مە ئەڤ حال بوو　　گـەلـۆ حـالـی تـە چـاوانە

دە کـا تـو وەر وەکـی بازی　　ب چـەنـگ وعوود وپەروازی
ل نـك داهـی ب دلـخـوازی　　ل بـال نـەذیـر ب مـهـڤـانە

( ٥٠ )

# نیرگزەك رەنگین مە دی

نـــیـــرگـــزەك رەنـــگـــیـــن مـــــە دی　　ئـــیـــرۆ ل بــــەغـــچـــانـــی تـــەمـــە
ســـۆر وزەر بــــوو ب خــــــــوەدی　　ئـــــەز بـــولــــبــــولــی باغی خــوەمە

ســـۆر وزەر بــــوو بــــی هــــەڤـال　　هـــــاتــــی ب ســــــەر بـائی شەمال
ئـەو راست وچەپ لـی بوونە خال　　ئـــەز عـــاشـــقـــی خـالـی تـــەمـە

خــــالـــــەك ل ســەر مــن یاری بەس　　دەرکـــــەڤ ل دونـیـائی قــەبـــەس
ســــەر هــش نامــیـنی کەس وکەس　　وی حـــیـــنـــی پـــەروانـــی تـەمـە

کـــەوکـــەب شــەفەق دی جارەکی　　وی عـــاقـــلـــی ســـوکـــران بکـی
داغـــیـــــن د دل دە کـــوور بـکـی　　تـــو بــــورجـی ئـەز نەجـمـا تـەمـە

بــــوغــچــەك بـهـاری کـەمـمـلـی　　ســـــەد گـــول د ناڤ دا عــەددلـی
ســـــونـــبــــــول ل دۆرا فـــتـــــلـــی　　مـــــەجـــــرووحــــــی خـارانی تەمە

خـــــار وی ل گـــــول رەنــگــان هەنە　　چـــەنـــدان وەصـــف دم زیــــدەنە
ئـــــەو مــــەعـــشـــوقـی جانی مەنە　　ئـــــەز عـــاشـــقـــی دەری تـــــەمـە

حارس وی بی سلاح چ کت      رۆز وشەبی ئەو شەر بکت
سەد جاری دل ئەو شا بکت      ئەز خەوجەئی بەندا تەمە

مسکینە موحتاج ئەبرووان      وەك گۆك ل دەستی زارووان
لیدان سەد وشیست کاشووان      تو میری ئەز لعبا تەمە

وەختی هەبت لعبا حەلال      من ناڤی قەط تم زیر ومال
سبحان ژ شاهی ( ذو الجلال )      ئەز طامعی نەقشی تەمە

نەقشی جەمال دا ڤی دنی      رەنگی زەرە خال کەتنی
هاتن ل بەر چاڤ من تەنی      ئەز موشتەهی حوسنا تەمە

حوسن وجەمالا دلبەری      ئاڤیتە دۆرا پەنجەری
لیدایە بائی سەحەری      ئەز مەست وسوکرانی تەمە

سوکرانی وان نەقشان دبووم      بۆ لەیلائی مەجنوون دبووم
رۆز وشەبی عاشق دبووم      موشتەری‌یی حوسنا تەمە

نوورها ل سەر وی غالیە      نیڤا بوستانا دانیە
هاتن طەواف سەد حاجی‌یە      ئەز عابدی حجرا تەمە

حجرا کوتوبخانا مە دی      زەندی کتابا لی مە دی
یەك خەط غەلەط قەط لی نەدی      ئەز ناظری دەرسا تەمە

دەرسەك موبارەك من دڤی     یەك دو كەلام شیرین دڤی
سەد موعەما من ژی دڤی     لی دائما فەقهی تەمە

ئوستاذی من دائم تویی     موئەللفی نەقشا تویی
دەرمانی ڤان دەردا تویی     ئەز كوشتیی ضەربی تەمە

ضەربەك ل تە دایە فەقیر     مەحبووس كری ئیرۆ نەذیر
مأیە تەنی داهی ئەسیر     ئەز مەقتولی قەتلا تەمە

( ٥١ )

# يا رەب پەریشانم ژ دل

یــا رەب پــەریــشـانــم ژ دل دل ژار ومـەسـت وخـسـتـەیە
ئـاگـر ل سەر جەرحین د کول ئەو عـالـمـی ب حـالـی مـەیە

ئەو عالـمـی ب حالـی مه بوو ئـەو زانـی پور حوب زیدە بوو
تـم کـوشـتیپی یاری خوە بوو مــن بــەحــر د نیشانی هـەیە

نـیـشان کو دانین چار طەرەف هـاتـن تەماشا صەف ب صەف
ئەو لـەشکەری بی ساس ودەف مـن دلـبـەرەك نـاڤ دە هـەیە

دلــبــەر سـەمـائـی هاتە دەر لـبـسـی ل وی هەر سۆر وزەر
مـن رووحـی شیرین دانی سەر جـانــی عــەزیـز مـن نەقدەیە

ئـاهــەك د سـالـی چـی دبوو حـوسـن وجـەمالـەك زیدە بوو
کـەیف وسورروور من هل دبوو رۆژ وشــەڤـی مـەیـخـانـەیـە

مــەیـخـانــەئـی دلبەر دناڤ مسك ئـەذفـەرا قەند وگولاڤ
پـور سـەر رەشانـد بەژنا زراڤ بــووم عـاشـق وســوکرانەیە

یا سـەهـلە عاشق رووح بـدی چـمـکـی رەقـیـب دەربا ددی
مــن گـۆ ئەمان هاوار خـودی ئــەڤ چ عـەذابـەك زیـدەیـە

مـن دى عـــەذابـەك پـور جەفا　　قـەلـبـى ل وان نـــەشـر ولـەفا
هـنـداد موحەمـمـەد موصطەفا　　ئـــەو شـــافـــىيـى قەلبى مەيە

نـــەشـــر ولـــەفـەك دانينه سەر　　مـــەخـــتـــووم كرن زير وزبەر
خوون وى ب مەوجا هاتـە دەر　　نـائـــى طــەبـيـبـەك بـۆ مـەيە

تـم ئـــەز دبـــيـــژم يا صـەواب　　جـان وجەسەد من بوو كەباب
كـانـــى حـــەيـــاتـا ئـاب وئاب　　ئـەو ئـاب ل نـــك عەينى تەيە

( عـيـن اليقـيـن ) نائى ژ ميـژ　　لـەو كـەتـيـە دل پيسى وقـەريژ
نـــەذيـــر بەسە بەس كە دريـژ　　ئـــەســـوەد حـەجەر قبلا تـەيـە

( ٥٢ )

## مه دلبەر دی ل محرابی

مـه دلبـەر دی ل مـحـرابــی　　د دل ده ئـاگــرەك هــلــبــوو
مـــه جـــان دایـــه د عەذابـی　　فـەلــەك دیسا جەگەر كول بوو

ئـــەزم ئـــیــرۆ بــریــنــدارم　　ل دەرگــاهــی تــــه زارزارم
شـــەب ورۆژی ب هـــەوارم　　بــژانــی جـەرگی بولبول بـوو

وەكـی بـولـبول دنـالـم ئـــەز　　شـوبـهی گـۆیـیـن دكالـم ئەز
ل بورجا ئەسـمـەرایـم ئـــەز　　شـوكـور دیـسـا شەمال هلبوو

وی شـەوق دابوو ل بەر تاڤی　　بــلا تــیـــر ورمـا بــاڤــی
مـــه جـان دەرمانی گول ئاڤی　　دەمــا دلـــبـــەر مـوقـابل بـوو

ژ گـول رەنگان گولا زەر تین　　سەحەر ئیـرۆ شیرین خەف تین
ژ دەسـتـی دلـبـەری بەر تین　　ژ بـەر وان با هیـن وكـول بوو

نـــه لازم بـــوو بـكـم ئەفغان　　نــه مـەحـبووبی تە سیتـەم كر
ئەگەر یەك جاری روو دت تو　　ئـــەزی بـــیـــژم ئـــەوە چل بوو

ب شـەوقـا وی تـەجـەللائی     ب وی حـوسـنا خودی دائـی
جـەمـال دایـە ل دونـیائی     ل نـاڤا بـاغـا مـووصـل بـوو

ژ بـەر حـوسـنی ئەزی دینم     ژ بـەر وەصلی کەزەب خوینم
وەکـی بـولـبـول ئـە نابینم     دەمـا گـول ئەی نەذیر هلبوو

# ( ٥٣ )

# ( تعالى اللّه ) جەمال دایە

( تـعـالـى اللّه ) جــەمـال دایـــە وی ئـیـرۆ
تـــو وی بـــمـــری ب ڤی دەردی فـــەقـیـرۆ
گـــەلـــەك گـــەریـام ل دونـــیـائـی تەمامی
نـــەدی من کەس ب مـثـلـــی تـە حـەقـیـرۆ
جـەگـەر هوور بوو ب ڤان نەقشی کو چیکر
نـــەدا مـــن نـوقـطـەیـەك ئـاڤـا نـــەمـیـرۆ
دنـالـــم ئـــەز ژ بـــەر حـــوسـنـا دەلالـە
جـــەمـــالـە هـــەم کەمالە هـــەم مـــونـیـرۆ
ب دۆســـتـــانــی نـــەظـــەر دا من عەجائب
وە ونـــدا کـــر ژ بـــەر چـاڤـی مـــە ئـیـرۆ
ذەلـــیـــل بـــوومـــە ژ بـــەر قوربا ویصالـی
زەبـــوون بـــوومـــە ژ بـــۆنـــا تـــە مدیرۆ
دبـــووم مـــەجـــنـــوون ل سەر ذاتی شەریفە
قـــە کـــەس نینە ب حـوسنا وی نـــەظـیـرۆ
نـــەکـــە نـالـیـن د عـشـقـی دا تـــو داهی
تـــو وی بـــمـــری ب ڤـــی دەردی نەذیـرۆ

( ٥٤ )

# یا رەب شوکور دیسا وەرین

یـا رەب شـوکـور دیسا وەریـن سەد گـولشـەنێ خارێ مـە ئەو
دۆرا سـەمـائـێ ب گـەرِیـن لەو مەقصوودا هێژ نـوومـە ئەو

هن تێن کو ئەو ئەهلێ عـەذاب قـەسـەم دکم سێ سەد کتاب
ئـەو تـاڤـێـژن شیش وکـەباب وا هـەر دڤـێـتـن نـان ودەو

دێ ئـەو ب فـکرا خوە چ کن سـەد داغ د دل دە کـوور دکن
مـن مـەنـفـیـێ چـالـێ دکن هـەر ئەو دخۆن سووندێ دەرەو

ئـەو چ دزانـن لـەذذەتـێ کـەیـف وسورروورا جەنـنەتێ
نـەقـش ونـیـشـانێ قودرەتێ خـالص ومـوخلص نـوو مە ئەو

خـالص ومـوخلص ئـەو تـەنێ مـن نـاڤـێ قـەط مولکـێ دنـێ
مـا دەم پـیـس وزۆر کـەتـنێ مـە ژ یـاقـووت ولوئلوئە ئەو

مـن نـاڤـێ قەط یەك یارە دی شـۆخ وشـەپـالـەك کـو مە دی
مـا قـەی نـەذیـر نـاکی فدی رِۆژ وشـەڤـێ دل خواز تە ئەو

( ٥٥ )

# يا رەب دنالم رۆز وشەب

| | |
|---|---|
| يـا رەب دنــالـم رۆز وشەب | زێـدە ل ســەر مـن بوون بەلا |
| سـەد شـيشە وجامـێ حەلـەب | هـاتـن جـەزيـرێ بوون جەلا |
| مـا دام د نـاڤ مـە ئەو هـەبی | فـەخـر وكـوبـارێ زێــدە بی |
| هـوون نـابـيـنـن قـەط ئەدەبی | چــاوا كـــو گـۆتـی مە مەلا |
| ئــەهـلــێ زەمان تەڤدە جۆتـن | مـــن ژی جـەگـەر تـم دسۆتن |
| هــەر وەكـی هـاتـیـيـە گۆتن | ( إن فـــرعـــــون عــــــلا |
| في الأرض ) لـەورا غەرق دكـر | كـوفر وظـەلالـەت زێـدە كـر |
| عـەلامـەت بـوو نيشان مە كر | هـــن ژێ دبـــوونـــە مـوبـتەلا |
| هــوون ناكـتـن قـەط باوەرێ | كـــانـــی صـــولاحێ مە بەرێ |
| حـــەتـتـا مـــرن بـۆ وە وەرێ | وێ ژ نـــوو بـــبـــێ هەلا هەلا |
| تــەوبــە بـــكـــن ئـەيا دەلال | طــەواف بـكـن شەيخ كەمال |
| پــێــرە فـەقـيـر ومـال وحـال | صـەبــرێ بكن ( حيـن غلا ) |

لەورا ئەو شـەيخ موستەرشدن　　دائـــم ( حـمـد الله ) ێ ددن
شـــوكــــر وثــەنـــا پيرِە ددن　　بـــەس وەقـــتـێ مە بوويە بەلا

ڤـــى وەخـتى مونكر پورِ هەنە　　چـــەنـــدا وەصـف دم زێدەنە
وەك شـــەوكا ئەو د رێ دەنە　　داهـــى نـەذير نوورهەك جەلا

( ٥٦ )

# داهی ما قەی تووێ کۆری

داهی ما قەی تووێ کۆری     تو ڕانابی لەزێ ناکی
هەچی هات و ژ تە بۆری     دە کا تو خوە خلاص ناکی

ئەزم پیرێ د عشقێ دا     ئەزم مەحبووس د قەیدێ دا
کەزەب خوینم د وێ ڕێ دا     ما قەی هێژ تو باوەر ناکی

باوەر کە تو ژ من ئیرۆ     بوویم گۆیین ل سەر دارێ
ژ دل چوو پێتەکێ ئاگر     دەما بسکێ خوە دو تا کی

دو تا کی تو کەزی وبسکان     ڕەشینی عەنبەرێ سەر وان
ژ بێهنێ پوڕ دبن سوکران     جەگەر هوور بوو ب وی خاکی

ب وی خاکی جەگەر هوور بووم     د عشقێ دا موظەففەر بووم
وەکی مەجنوون ئەزێ هەر بووم     ل لەیلائێ کو لۆما کی

مە دل چووبوو ژ بەر دلبەر     دەما پەردە ئاڤێتن سەر
ئەزێ چ بکم بێ چەنگ وپەڕ     د محرابێ خویا ناکی

ئیلاه ئەو نێرگز ورەیحان     غەمێ دل دجلە وسەیحان
نەذیر وێ چی ب ڤان دەردان     ژ با خوە تو شەفا ناکی

( ٥٧ )

# ڤێ سەفەرێ ئەز دین کرم

ڤــێ ســەفــەرێ ئـــەز دیـــن کرم هـــەوار ژ دەردێ ســـەفـــــەرێ
ڕۆژ وشـــەڤـــێ بـــێ هـش کـرم هـــەوار ژ دەردێ ســـەفـــــەرێ

ئـیـرۆ فـەقـیـر بـێ هـش کـری مـەحـبـووسـێ زیـنـدانـێ کری
ســەر چاڤـێ وی خوون ڕێژکری هـــەوار ژ دەردێ ســـەفـــــەرێ

پـــورِ جاری بوو ئەو خوونا ڕەش مـامـە سـەر یـێـك تـم بێ لـەش
لـەو کـو مـە دی ئەو بەرێ ڕەش هـــەوار ژ دەردێ ســـەفـــــەرێ

بـــێ لاش وبـــێ سـەر یەك دمام مـا ئـــەز ژ ویـــصـــالـێ ڕەڤـــام
مـەکـتووب ب دەمعا بوون ختام هـــەوار ژ دەردێ ســـەفـــــەرێ

دەمـــعـێ ل چاڤ دجلە وفەرات نـاظـر دبـــووم قـــاصـــد نەهات
هـێـڤـی دکـم بـچـمـە نـەجات هـــەوار ژ دەردێ ســـەفـــــەرێ

هـێـڤـی دکـم بـــال تـە کـەریـم ڕەحـمـێ بـــکـــە ئـــەیا ڕەحیم
مـە خلاص کە ( من نار جحیـم ) هـــەوار ژ دەردێ ســـەفـــــەرێ

نـــارێ دلا نـــای گـــۆتـــــنـــێ حـــوسـن وجەمال کەت ڤێ دنێ
جـــەرگ وهناف سۆت من تەنێ هـــەوار ژ دەردێ ســـەفـــــەرێ

ڤــێ ســەفـەرێ مەدفوون کرم	ئــەز مــوغــنــیـیێ دنێ کــرم
جــان ئـــەز ژ رووحـێ دکــرم	هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

نــوورهــا مــونــەززەه من دڤێ	ســەد دو قـەداح مــن ژێ دڤێ
دائـم ســەحـــەر خەف من دڤێ	هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

پــورِ زێــدە بـوون دەرد وئەلـەم	حـێـسـتـر ل چاڤێ من بوونە چەم
مــا کــی دزانــت کەیف وکەم	هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

( کـم مـرة ) مـەعـشـووق ددی	هەروەخت ل سەر طوور من ددی
رەمــزەك سـەحەر هـەر من ددی	هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

ئـــیـــرۆ ســەحـــەر ئـەز داعیـمە	دائــم ل سـەر مــوشــتـەریـمـە
ســەرعــەســکـەرێ ئـالائـیـمە	هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

دیــوان گـەڕانـدن پــورِ گەلەك	هاتن ژ ســەمــمـائـێ مــەلــەك
دۆرا حــەجــەر بـوونە خەلـەك	هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

نــەظـەر مە دا وان دوور کـەتـم	بــێ هش ل ئەرضی ئـەز کـەتـم
گـەر ئـەو نەبت ئەز بێ خـەتـم	هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

یا رەب عــەلـیـــل دوعـا دکـی	رۆز وشـــەبــێ زاریـــن دکـــی
ب وەصــلا وی دا تـو شا بکـی	هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

یـەك نـوقـطـە نوور تو دەینی بەر　　مــەعــشــووق ببینی هەر سەحەر
مــیــم پــێ ویـا وغـەیـن وبەر　　هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

کـەس نـیـنـە کـو مەهدەر بکت　　ئــەڤ عــەبـد تەنێ دوعا دکت
بــەس عـاشـقـان مەقهوور بکت　　هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

سوبحان ژ شاهێ ( ذو الـجـلال )　　دا مــن مـــەی وئـاڤـا زەلال
مــن نــاڤــێ ئــەڤ دونیا ومال　　هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

ئــەی داهــیـێ کـەلام شرین　　نــوو بوو ل دل حوبب وئەڤـیـن
نــەذیــر دبــوو عـاشـق ل دین　　هــەوار ژ دەردێ ســەفـــەرێ

( ٥٨ )

# دلبەرا دێمیٚ ب نوور

دلـــبــــەرا دێـمــیٚ ب نــوور شــەوق دایە بورجا ئەسەدی
( أحـــســـن الله تـبـــارك ) ژ ویٚ نـــوورا ئــەحـمــەدی

ئـــەز دبـــووم عـاشـقیٚ نووریٚ هوون ل من لۆما نەكن
ئـــەز چ بـــێـــژم د حـەقـــیٚ ویٚ تەڤ ژ من باوەر بكن
وەكـــی قـەنـــدیل پیٚ كەڤن پەروانە خوەش قستیٚ دكن
ســاعـــەتــا نــیـڤــیٚ شەڤیٚ ئەو خوە ل من ظاهر دكن
چـــل بـــریـــنـــان لــیٚ دكـن تەسلیمی لوقمان من دكن
دشـــدیـــنـــن ســـەر وپـا نـوو قەید ومەربەط من دكن
بـــیٚ خـــەطـا وســـــووجــەكی گرتیییٚ زیدانیٚ دكن
ئـــەز دكم نالــیـن وزاریٚ بەس ل مـــن ظـولــمــیٚ بكن
هــوون ژ لــوطـفـا خـــوە بنێرن رەحـمەكیٚ بۆ من بكن

ب عـــەلـیـــل دن نـوقـطەیەك نوور ئەو ژ نوورا ئەبەدی
دلـــبــــەرا دێـمــیٚ ب نــوور شــەوق دایە بورجا ئەسەدی
( أحـــســـن الله تـبـــارك ) ژ ویٚ نـــوورا ئــەحـمــەدی

مـــن دڤـــیٚ ڕۆژ وشـــەڤـــیٚ دەرمـانـــیٚ لوقمانی ل بال
دا كـــو صـــافـــی كـــت بـریـنان ب من دی ئاڤا زەلال
پـــێـــڕە جـامـەك ویٚ تـژی ئیرۆ ژ دەست شۆخ وشەپال
ب فـــەقـــیـــر وعـــەلـیـلان دی تم ژ ویٚ خەمرا حەلال
هـــەر دەمـــا كـــو ب مـن دی من ناڤیٚ قەط دونیا ومال
دا ب ویٚ كـــو ئـەز طەواف كم دلبەرا حوسن وجەمال

بـێـــم تـــەمـــاشـايـا دەلالـــیٚ نـێـر گزا پورٍ خەط وخال
بـــكـــەڤـــم نـــيـــڤــا بـــوستانا بۆسم يەك گول حەلال
بـــێـــهـــن بـــكـــم سينه ب سينه ئەز رٍۆنـم نووڤه ل بال
فـــيـــل ورەخ ویٚ د جـــەريـــدیٚ ئـــەو نەما دائم قەبال
دەربـــا كـــو دانـــی د دل دونـــيـــائـــیٚ دە كەس نەدی
دلـــبـــەرا دێـمـیٚ ب نـوور شـەوق دايه بورجا ئەسەدی
( أحـــســـن الله تـبـــارك ) ژ ویٚ نـــوورا ئـــەحـمـەدی
بـــمـــرم ئـــەز ب جـــەفـــائـیٚ كی هەیه مەهدەر بكت
مـەحـــبـــووس ومـــسـكـيـنیٚ دل ئیرۆ ژ زيندان دەر بكت
پـــورٍ ڤـــەوابـــەك زێـدەیه بۆنا خوه ئەو سەد حەج بكت
مـا حـەتـــا بـێـت عـەرەصـا مـەهـجوور بلا ئازاد بكت
تو ب من دی رەحـمـەكـیٚ یا رەب ب لـوطفا خوه بكت
تـــو بـــنـــێـــری ئـاسـتـانـا عـــــەبـــدەكـی ئـازا بكت
تـــو بـــدی وی كـاســەیەك نوور دلـــیٚ خوه پیٚ شا بكت
دا مـــوراد ومـــەقـــصـــەدا دل ئـەو ب ویٚ حاصل بكت
عـــەنـــبـــەر وكـــافـــوور ومسكی تێكلی هەڤ ئەو بكت
ســـەد وســـی فـنجان د دەست دا ئەو ل دائیٚ خوه بكت
لـیٚ دســۆتـی جـــەگـــەرا وی خوون بریـنان كەف ددی
دلـــبـــەرا دێـمـیٚ ب نـوور شـەوق دايه بورجا ئەسەدی
( أحـــســـن الله تـبـــارك ) ژ ویٚ نـــوورا ئـــەحـمـەدی
دەرمـانـــیٚ دەردیٚ دلا تـو تـــێـــكـــلـــی هـــەڤ هەر بكه
تـا سـەحـەر دو بـێـته دەر جەرحیٚ خوه پیٚ دەرمان بكه
شـــەكـــەر وئـــاڤـــا حـــەيـــاتـــیٚ هـــەم د فنجانیٚ بكه
ســـەد شـــوكـــور حـــەمـد وڤەنا بۆنا خودائیٚ خوه بكه

صـــەف ب صـــەف تـێـنـە سەمائێ تو تەماشا وان بکە
حـــوور وولـــدانـــێ د غــورفـا دائـــم قەستا وان بکە
نـــێــرگــز وگـول وێ ل بەغچان تـو سەیرانا وان بکە
ب حـــەلالـی بـــبـــۆســـە یـەك تا تو ژی ژی وان بکە
شـــێست وشەش پەل لـێ هەنە دائم د جیێ وان بکە
دورٍ وئـــەلـمـاسـێ ل قـەصـرا کـەیفا خوە بێ وان بکە

ئـــەز دزانـــم ژ بـــۆنـــا وا هـــەر ل تـە طـەعـنـێ ددی
دلــبـــەرا دێـمـێ ب نـوور شـەوق دایە بورجا ئەسەدی
( أحـــســـن اللّٰہ تـبـــارك ) ژ وێ نـــوورا ئـــەحـمـەدی

طـــەعـــن ودەربـــێ وێ گـرانـن ئەز ژ بەر نابم خلاص
وی ددانـــی ل پـــوشـتـا مـــن بارەیـەك تـەڤدە رصاص
ب ســـەمـــائـــێ تـــو وەرە داهـــی ژ نـوو ببنە رەقاص
ب رمـاحـــێ بـــکـــوژم تـــە جـان دبی بۆ من قصاص
ڤـــی زەمـانـــی کەس تو نینە کو نەبت ئەو هەر بەلاص
وێ د بـــەحـــرا قـــودرەتـــێ ئیرۆ ژ نوو بوونە غەواص
خـــر خـز وســـارق د چـەرخێ دێ بیتن ( حین مناص )
مـا رەوایـــە کـــو مـــە دی تـن سەد ئیرۆ پەریێ رەقاص
نـاظـر ومـونـتـەظـرم نـاڤ بـەغـچەئێ ئەو بوونە خاص
بـێ خـەطا مەحبووس کرم پورٍس ناکتن قەط ئەو ل پاص

چ عـەجـێـبـەك بـــوو نـــەذیر ئـیـرۆ ژ بـەر ناکی فدی
دلــبـــەرا دێـمـێ ب نـوور شـەوق دایە بورجا ئەسەدی
( أحـــســـن اللّٰہ تـبـــارك ) ژ وێ نـــوورا ئـــەحـمـەدی

( ٥٩ )

## دلبەرا شۆخ وشەپال

دلــــبــــەرا شــۆخ وشـــەپـال خـال دايـە دۆرا قـەمـەرێ
( أحــســن الله وتــبــارك ) ژ وێ حـــوســـنـــا دلـــبـــەرێ

ئـــەز دنـــاســـم رۆز وشـــەب كـو مە ددين خال وزولف
وێ ل سـەر تـەخـتا حەقيقى پەرى هاتن صەف ب صەف
مـــە نـەمـا صەبر وسوكوونەك هەر ژ بەر شوترى ولەف
د ســـەمـائـــێ دە هەژاندن چەنگ وعوود وساس ودەف
مـــە نـەظـەر كـر ژ خوە ڕە خوون ل بريان بوويە كەف
مـــە ژ دل نـال وفـــغـــان دا سـەد وبيست ودو ئەسەف
مە جەواب دايە ب قەلبان سەحەرێ بێن خەف ب خەف
گـــۆ نـــەصـــيـــبـــەك ل مـــە بـــۆ تـــە نائێ ب خەطەف
ئـــەو چ جـــنـــديـــنـــە پەياپەى دەرێ عەينان بوونە صەف
مـــە ژ بـــەر وان جـان ددا ئـيـرۆ د بـەيـعێ ب سەلەف

مـــونـــتـــەظـر ئـەز دبـوويـيـم يا رەب شوكور ديسا وەرى
دلــــبــــەرا شــۆخ وشـــەپـال خـال دايـە دۆرا قـەمـەرێ
( أحــســن الله وتــبــارك ) ژ وێ حـــوســـنـــا دلـــبـــەرێ

چ بـــكـــم ئـــيـــرۆ بـــريـــنـــدارم ژ دل نـالـيـن دهـات
مـــا هـــەيـــە ڕوونـن ئەز وئەو ئەم ل تەخت بگرن جڤات
دەم ودەم ئـــەم ددنـــێ هـــەر وەخت ببينن لوطف وذات
هـــەر دەمـــا ظـــاهـــر دبـــن ئـيـرۆ ل مـە ڕۆژێ هـلات
ڕۆژ وشـــەڤ ئـــەم هـــەر دنالين مە نەما بوو قەط حەيات

بــێــن طــەوافـا حــەجــەران دائـم د وەقتێ عەرەفات
خــوەش ببـيـنـن لـەذذەتـێ چـاوا كـو گـۆتن راويات
حــوور وولـــدانــێ ل كــەوثــەر بــۆ مەنە ئەو قائمات
ئــەز دكــم هـێڤـی ژ وان ئـيـرۆ دخـوازم ژێ نـەجات
ئــەو ببــۆســم يــەك ژ وان ڕۆژا قـيـام وعـەرەصات

نــەقــش وئــەلــمـاســێ ل بــەژنـا وی مثالا بـەشەری
دلـــبـــەرا شـــۆخ وشـــەپـال خـال دايـە دۆرا قـەمـەرێ
( أحــســن الله وتـبـارك ) ژ وێ حــوســنــا دلـــبـەرێ

ما ب صـەحـرا نـەكـەڤت رووحێ كو دەربەك لـێ هەبی
گـــەر چـڤـا كـو ئـەو غەنی بت چاڤ ل بەر دەرێ تە بی
بــوومــە عـــاشــق ل وصـــالا پـــەرێـيـا وەك كەوكەبی
دل دبـــوو پـێـت وپـوورونـگ ڕۆژ وشەڤێ حوب زێدە بی
شـاهـێ شـاهـان گـەر نـەظەر دی وێ ل مە دەريەك ڤەبی
ئـاە وحـەتـتـا مــرنــێ نـابـی ژ بـيــر رۆز وشـــەبی
كـــو ب مـــن دی زەررەيەك نوور وە مـثـقالـەك زێـدە بی
ئــەز دكــێــشــم د جــەفــائــێ حلم وجوودا ئەدەبی
كـــی دگـــۆ عـــاشــق ومـــسكين ئەو بلا مەهجوورە بی
بــولـــبــولـێ مــەجــرووحێ خاران هەر ب فغانا تەبی

ئـــەز دبـــيــــنــم نــێـرگـزا شەنگ د سەمائێ سەحەرێ
دلـــبـــەرا شـــۆخ وشـــەپـال خـال دايـە دۆرا قـەمـەرێ
( أحــســن الله وتـبـارك ) ژ وێ حــوســنــا دلـــبـەرێ

نـێـرگـزەك ڕەنگيـن مە دی ڕەنگێ ل وێ بوو سۆر وزەر
مـــن نـــەظـــەر دايـــە ل بـوغـچـان ناڤا بوستان هاتە دەر
مـــە درێـــژكـــر دەسـتێ خوە خارەك ژ نوو ئەو هاتە بەر

طـــەعـــم وبـێـهـنـا وێ بـەلا بوو وەكى لوئلوء وعەنبەر
ئـــەز دبـــم ســـوكـــران ژ بـێـهـنا د شەبێ تا ب سەحەر
رووح ورەوحـانـــێ د چـــوو جـوثـشـه دما گەل وایه سەر
چ عـــەجـێـبـەك ل دنـــێ بـــوو مـام تـەنـێ ئەز بێ مەفەر
پـــوڕس بـكـن هـوون ژ عوشاقان چاوا روح وان تێته دەر
ئـــەز دبـــیــــنــم دژمـــنــان مـامـــه تـەنێ بێ چەنگ وپەڕ
ئـــەز دكـــێـــشـــم ئـــەلـــەمـێ زێـده ژ ضەربێ تیر وبەر
مـه دى تـیـڕێـــژەك دهات خـەف بـوو ژ رەمزا دلبەرێ
دلـــبـــەرا شـــۆخ وشـــەپـال خـال دایـه دۆرا قـەمـەرێ
( أحـســن الله وتـبـارك ) ژ وێ حـــوســـنـــا دلـــبـــەرێ
داهـــی ئـیـــرۆ دكـــی گـــازی یـا رەبـبـی ئـەز چ بكم
شـــەرحـا تـەلـخـیـص وكـافـی ل وەصـفان جاری بكم
وەصـــفـێ وی نـابـــن تـــەمـام ڕۆژ ب ڕۆژ زێـــده بكم
ســـووســـن وسـونبول د ناڤ ده ئەز د گەل سەیران بكم
وی زەمـانـــێ د ســـەیـــران ئـــەز ب وان فـەیـدێ بكم
دبـــووم مـــەجـــنـــوون ب وصـالـێ تـەمـاشا دائم بكم
ســـەجـــدەیـــەك دو لازمـن ئـەز هـەر ژ بۆ وان ڕە بكم
جـــەرگ ودل هـــەردو بـــورشـــتـــن لازمـــه فغان بكم
وێ ل مـــن دا ڕمـــەیـــەك گـــۆ ئـــەز مـــورادێ ته بكم
ل نـــەذیـــر سـۆتی دل وجان مـثـلـــێ ئاڤا مـــەجـمـەرێ
دلـــبـــەرا شـــۆخ وشـــەپـال خـال دایـه دۆرا قـەمـەرێ
( أحـســن الله وتـبـارك ) ژ وێ حـــوســـنـــا دلـــبـــەرێ

( ٦٠ )

## دلبەرگەلەك دەلالە

دلــــبــەر گــەلــەك دەلالــــە ژ بــۆ مــن بـــوو مـــەراما
ئـــەو پـــورِ شـــۆخ وشـەپالە ئـــيـــرۆ ل ناڤ بـەغـچـا مـا
چـــنـــگـــە چـــنـگە خرخالە نـــائـــێ ب دەست دوعا مـا
هـــوون کـــو نـەخۆن حەلالە بـــۆ کـــەس نـابـت مـەقـاما

ڕابـــن تـــەڤـــدە هـــەڕن ژۆر بـــســـەکنن هـوون ل ئـالـی
نـــەچـــن وەکـی گـور وتـۆر بـــبـــۆسن هوون ب حـەلالـی
وەك گـۆڤـەنـدێ وەریـن دۆر نـــازك هـــــەڕن ب دەلالـی
نـــائـــێ ب گـــــازی وزۆر ب دەڤ ئـــاڤـــا زەلالـــی

خـــەبـــەر دائێ ب ذەلـیـلی نـــاڤـــا فـــورات دبـــوو بەط
مـــن گـــازی کـر ب عـەلیلی نـەهـات ل نـك من ئەو قەط
گـــۆ تـــو ئـــيـــرۆ قـەتـيـلی تـــو نـابـيـنـی تـو غـــەلـــەط

چـــاوا بـــچـــمـــە جـڤـاتـێ ل نـــك ڕوونـــم بـــبـــێـــژم
ژ بـــەر شـــەوقـــێ هـەوا تـێ حـــوضـــووریێ کـــەڕ وگێژم
ل دەردێ مـــن شـــەفـــا تـــێ بـــريـــنـــدارەکێ ژ مـــێـژم
بـــيـــنـــن بـــۆ مـــن دەواتـی خـــوونـا قـــەلـــبـی بـريـژم

دەردی دلا گرانا — نەوی ب سەر تو قەط کەس
وەکی مریی جەڤانا — ناکن تو جار ژ خەو بەس
نیڤا سووك ودکانا — سەری من ما بەر مەقەس
ژیکرن پەهلەوانا — کو من دی تی یەك قەبەس

بەلەنگازی زەمانم — زوا بوونە من کانی
ل نك وا ئەز حەیوانم — کەس ئیشا من نزانی
ل ناڤ بەغچە وبوستانم — ژ بۆ من سیڤەك ئانی
نەکو ئەز ڤی نزانم — دترسم من زەبانی

دزانم ئەز خەبەر دم — نە وەك وەحشی چۆلا مە
ل ناڤ دارا خوە بەردم — نە ئەز گوری چیا مە
ب دل مسك وماوەردم — بەلی ئیرۆ گەدا ما
کافوورەك ئەز ل عەردم — ل نك وا بی بها ما

رابە سەر خوە خەبەر دا — فەصاحەتکی بریژە
ژ بۆ ئنسانا تەڤدا — دەر حەقی ڤان ل میژە
وە دینی خوە دبەردا — وە دابوویە ب قریژە
هوون ب مرن ژ کەردا — ببن تەڤ کەر وگیژە

داهی بەسە دەلالۆ — نەکە نالین ب زاری
ببیژە تو یا خالۆ — تو ناترسی ژ ماری
ببت ژ تەر هەڤالۆ — د قەبرا رەش وتاری
نەذیر دبوویە کالۆ — دل وجانا خوون خواری

( ٦١ )

# ئەی حاضری قەصری

ئەی حاضری قەصری تووی هەر وەخت ب ئەفغانی
کــەس ب تــە نـزانـی
نــوورهـا قـەمـەری بـۆ تـە ل سەر کەوکەبی دانی
مـا هــی تـو چـاوانـی
دل فــولــکـە ل ســەر بــەحـری دەست تی هلانی
دور وئەلماس وی دەرانی
بەس داهی داهی نەژیر سی سال د بەندی تو وەهانی
بــی چـــارە زەمــانـی

( ٦٢ )

# بغچلر بن با ختم

( ب زمانی ترکی )

بــغــچــلــر بـــن با خـتـم سـوگلیم ایچنده
نــقــطـــلــر بــن گــوردم مـعـنـا آلـتـنـــده
عــلامـــتـیـنـن بـن گــوردم فـقـط بـلـیـمورم
ســـزدن اســـتـــیـــورم کــعــبـه یانـنـده
جـانــم یـا نـیـــور قـــلـــبـم آجـیــور
دنـــیـــایـــه ســـونـــرك مـــزارم تا شـنـده
قاچ ســـنـــه الـــــدی غــربــتــده قـالـدم
بـــن بـــیـــلـــه گــیــدرم زمـان یـا خـنـده
غـــربـــة ایـــدیـــور گـــوزم آغـلـیور
دنـــیـــایـــه هـــر گـــیـــدر گـوزلرم یا شنده
دنـــیـــایـــه قـــهـــوه وار هـر شخص یارن وار
گــور دنـــو زمـــان پـــــرداق الـــــنـــده
نـــذیـــر ســولـمـیـش سو گلی آلـمـه‌میش
هــر کـــس گــیـــدیـــور تــپـراخ ایـچـنده

## ( بیرس دا سولجیم إن شاء الله )

قهولر باختم باختم بیر پرداق ینی گوردم
بن سنه چوق سولدم سنن نه وار ایچنده
سن نه دیور سن نه دیور سن اگر بنی آلر سن
سن جانن ساغ اولسن عفیه السن سننده
باشقا سنه سولمه بیر دهاسن المه
اگر پرداق قررسن باشقه ایچ سن قشنده

## ( بیرس ینی وار )

چیچك لر دالده قالدی بالك لر سولده قالدی
هفتیه گیشنی گلمدی گوزلرم یولده قالدی
الله بو امر ڤیر دی بیر شخص غربتده قالدی
هر کس بیر درد درن وار قشلریو اسز قالدی
کیمه دردم قنوشمیور خسته درمان سن قالدی
تختور بیر هیچ کیمه یوك نذیر گبی هپ قالدی

( ٦٣ )

# ئەڤ موجادەلە

## ( شیخ نەذیر ـ داهی ) و ( شیخ بەشیر ـ بی خەو )

داهی :

سـەلام سـەر دلبەرا مەحبووب    چ کـەوکـەب بـوو ل بـورجانا
ژ بـۆ مـن هەر تویی مـەطلووب    زەمـان وسـینـە وحـیـنـانـا
کو رۆژ وشەڤ دبن مـەقلووب    دبـیـت ظـاهـر ل مـەیـدانـا

بی خەو :

چ ئـنـقـلاب کەتی دەوری    ل مـەیـدانـی ئەسـیـر مایـە
ب دەربا ظولـمەت وجەوری    د زینـدانی چ قـیـر دایـە
کو سەد حەیفە د وی غەوری    ژ بـەر چـاڤـی مـە وندایە

داهی :

ل مـەیـدانـی دبـوو ظاهر    شـەفەق دابوو وەکی رۆژی
د عـشـقـی دا ئـەزم ماهر    ل سەر وی تەرحا بشکۆژی
کـو چیکر حوسنا وی قاهر    ب وا نـەقـشـا دلا دسۆژی

بی خەو :

کـو سـۆتـی جـسمەکی نازك    ب پـەنسی فورقەتی رەش کر
ژ تـەبـعـیـدا تـە شەهبازك    د حەبسی لەو موشەووەش کر
ژ رەنـگـی سـووسـنـا نازك    د وی وەنـسـی مونەققەش کر

داهی :

چ خوەش نەقشن خودا چیکر ل باغ وبـەغـچـەئـی بـولـبول
ب یـەك جاری نـەظـەر لیکر ئـەمن سەر وی دبوون دلکول
ژ بـۆ عـەبـدی خوە ئەو ریکر ب من ئەو بوو سوار دولـدول

بی خەو :

عـەگـید کەتیە ئەوی قالـی کـــەتـی حەددی د ئدراکی
د دەست دا شوبهەتی ئالـی دخـــوازن ئـەو مـە ئـازاکی
بکـیشم نـوقـطـەیـا فـالـی بەلـی ژ غەبری خـویا ناکی

داهی :

وەکـــی دولـــدول د حـەربی دا ل پـوشـتـا وی عـــەلـی سووار
چ عـــەگـــیـــدە د جـەنـگی دا ئـــەوە صـاحـبـی ( ذو الفقار )
رم وتـــیـــری د بـــــەر وی دا کو دانین ئەو د دل چوون خوار

بی خەو :

د دل چـوون خوار ژ غافل دا مە دی یەك جار برین خۆ بوو
ژ وی دەربـــا رمـــا مـــل دا نـــەیـا زوخ ژیرە هی دو بوو
ژ وا قـــاســـا ل ســیـفـل دا حەقیقەت ئەو د دل چوو بوو

داهی :

مـە دل چـووبوو ژ بەر دیسا ب دو چەشمان ئیشارەت کر
کـانـی هـودهوودی بەلقیسا مـە ئەرواحەك ئیجارەت کر
د قـــەســـری دا دتـەیـیـسا ئـــەوی نـائـم هشیارەت کر

بی خەو :

هشیار وسەرخوەش ومـەستە ژ نـوورا چاڤـی شـەهلا بوو
ب عـوود وعـەنبەر ومەستە ب ئـنـشـاء و ب ئیملا بوو
چ فـەرفۆرەك ل سەر دەستە ژ نـــەوم وغـــەفـلـەتی رابوو

داهی :

ژ نـەوم وغـەفلـەتـی رابوو هـەر ئەو رۆژ وشەڤی ئینان
ل وان بورجان نەظەر دابوو ددی تـن عـەقد وپەروینان
ژ بۆ ئەللاھ شوکور دابـوو ڤـەخوار ئاڤ فنجانی ڤینان

بی خەو :

ژ ڤینان کـەس نەدی بی دەر چـڤـا کـو بـیـتـە دیـوانی
هـەزار مثلــی وەکی عەنتەر ژ کـوفـری هـاتـە ئـیمانی
دزانـــن کو دبن مەیـخـوەر بـەلـی ئەمـمـا ژ فـنـجانی

داهی :

د فـنـجـانـی دە مەی نـۆشی دەما دل چوو ل سەر طووری
دزانـم کـو تـو مـەدھـووشی ژ بـەر شـەوڤـا ل وی نووری
ذەلـیــل جانـی خوە دفرۆشی ب وی ئـاڤـا د فـــەرفـــۆری

بی خەو :

دەمـا ئـاڤـا زەلال دیـبـوو طـەبـیـعـەت جن وئنسانا
ژ پوشت پەردی دەرانیبوو د دیـوانـــی دە ئــعـــلانـا
ژ کـەنزا خائـو شاھی بوو بها هـەر ئـــەو دل وجـانا

داهی :

وی جـان دابـوو ل دونـیـائـی دە سەربەست بت د قەبری دە
کـو رووڕەش بـم عـەرەصائـی چاوا بـچـمـە حـوضووری دە
مە گـۆ شـیـریـن ڤـاصـد نائی ئـــــەزی بـــمـرم د چـیـی دە

بی خەو :

ئـەگـەر بـمری د چـیـی دە بـەلـی دیسا مـونەووەر تی
وەکی مـەیـتی د ڤـەبری دە ب سەر دا یەك ڤوزەڤەر تی
چـڤـا بـیـژم د شـعـری دە ژ عـشـڤـا حوسنا دلبەر تی

داهی :

چ دلبەر بوو ل ئەسمانا — دە حوسنا لی وەکی بەدری
ب رەنگ نیرگز ل بوستانا — ژ بەر وی ئەز کەتم عەردی
ب من چیچەك ورەیحانا — طەواف کم ( ليلة القدر ) ی

بی خەو :

دڤی بیت ( ليلة القدر ) ەك — دا روونی صووفییی خلوی
تا نوو بت نووڤە لی بەدرەك — وەکی عەقرەب ل وی سلوی
بکیشی قووەت وصەبرەك — طەوافکی دا ب وی خلوی

داهی :

طەواف کم ئەز د غورفا دە — حەتا رۆژا قیامەت بی
نیڤا ( جنة المأوی ) دە — بلا هەر وەخت سەحەر خەف بی
کو کەوثر بوویە موورادە — ل بەر عەینی مە ئەو دەر بی

بی خەو :

ل پیشبەر عەینە ئو دیدان — خویا بت هەر وەکی دەرخی
ویصالا نەفی وتەبعیدان — هەر وهەر دال دکت سەرخی
د بەحشا گەشتە ئو عیدان — ب نەظمی رە ددت چەرخی

داهی :

بدم چەرخی ل دۆرا وی — ب چەنگ ولنگ وپەروازا
خەط وخالی ل موهرا وی — دهاتن خوار وەکی بازا
ل من ئەو هەر د بۆرا وی — وەکی سولطان وشەهبازا

بی خەو :

ژ شەهبازان نەمان راوی — بشارەت کی د ڤی ری دا
ژ تەختۆران نەمان راوی — تەداویکی د چەرخی دا
ل سەر سووران نەدی ماوی — د گۆڤەند و د چەرخی دا

داهی :

د چـەرخی دا ئەزی دینم ل بـەر یـی بوونە لـەیلائی
بــریــنــدارەك ل ماچینم ژ بۆ من یەك طەبیب نائی
ئـەگـەر یەك جاری ببینم ( الله ) دشـیـنـی شفائـی

بی خەو :

دخـوازن لـی شـفـا نـیـنـە ل دەربـا صـاحـبـی دەربی
مـە دوعـا دەور ویـاسـینـە حەتا کو ئەو موظەففەر بـی
شـفـایـا گـەل دل وسـیـنـە ژ دەستی باری ئەبـتەر بـی

داهی :

شـفـایا دەردی مەهرە ئەو دڤـی مـن دەرس ژ کـتـابا
ب رۆژ وشەڤ ببیژی ئەو ب عـوود وچـەنگ وربابا
هەژینی زولـف ودیما ئـەو ببـیـژ عاشـق تـو ژی رابا

بی خەو :

دەما رابـی ژ پوشت پەردی ب نەقش وگولـکی چیناوی
ل سەر دیمی ئەوی گەردی ژ نـووڤــە هـاتـی شینا وی
دبـت مـیـما ل بن عەردی ل دیـمـی هـات ئـەڤینا وی

داهی :

ل وی دیـم دور وئەلـماسا شـەفەق چوویە حەتا چینی
بـدن دەست دور ودورناسا دە نیشانی وی ئـەو بـیـنـی
وەصف دی ئەو ژ بـۆ ناسا بۆنا یەك حەق غـالـی بینی

بی خەو :

بـهـا لـی کـەتیە مـەیدانی حـەتـا کـو هـاتـە بازاری
ژ شکلی سـۆر گولـستانی د فـــەصـــلا نوون وئازاری
حـەقـی عـاشق تەنی زانی کـو غالی کت ل دەوواری

داهي :

ده غالي كت ئەو حوسنا لـي    وەكي نيـرگـز ل وى لاتـي
ژ مـوشـتـەريـا ددم مـەيـلي    ل ديـــوانـــي د جـڤـاتـي
مـە جان دايه ل سەر سەيـلي    وەكي مەجنوون ب لـەيلا تي

بي خەو :

ب لـــەيـــلا شـادمـان نـيـــنـــن    نەهن وەك وى چو كەس مەجنوون
وەلـەو كـو چـيــن ومـاچـيـنـن    ژ عـشـوە صـوورەتـي مـەحزوون
ب قـامـــەت ســوسـنـي شينـن    جـڤـاتـا گـولـزەر وبـەيـبـــوون

داهي :

جـڤـاتـي ده پـەهـلـــەوانـم    مـە نـيـنه شوور هەرم حەربي
نـاظـر ئـەز بـووم ل بوستانـم    ژ بـــۆ مـن سووسنەك زەر بي
وەكـي بـولـبـول ب ئەفغانـم    د خەو ده گول ته دى دەر بي

بي خەو :

حەتا بـمـرى ئـەوى هـا بـي    ژ دەســتـــي ڤي گولا چيني
ژ نـەعـاســي دەمـا رابـي    ژ قـــەهـــرا دايـــە ئـاخـيني
وەكـي بـولـبول ژ خەو رابـي    ما وى بەس كي ژ ڤي شيني

داهي :

بـەسـە ( داهـي ) ژ ئـەفغانا    د دل ده ئـاگـرەك بوو پيت
چـقـاس چـيـچەك ل بوستانا    تـو نابـيـنـي دەما ئـەو تيت
( نـەذيـر ) نيرگـز ل بەلـتانا    ئەو حوسنا كو ژ ژۆر ئاڤيت

بي خەو :

حـەقـيـقـەت حـوسنيا ژۆر بوو    د بـــورجـا سـونـبـولـي دا دەر
ب وى فەصلي كەر وكوور بوو    ژ ديـواني ( بـەشـيـر ) كر دەر
نـە وەك داهي ل سەر طوور بوو    ژ داغا دل ســـەلام كـر ســـەر

( ٦٤ )

# گوفت وگۆیین هەردو برا

# داهی و بی خەو

داهی :

سـەلامـی مـن بـی خەو دیسا  سـەلامـی عوود وعەنبەر لـی

ب مـن شـعری تـە تـەیـیسا  ژ رەنـگـی مسکا ئەذفەر لـی

وەکـی هـودهـوودی بەلقیسا  د وی قوطری موعەططەر لـی

بی خەو :

دڤـی مـن عـطـرەکـی تازە  ژ نـەقـش وصونعی باری بی

ئـەگـەر نە ، ئەو عطر شاذە  دلـی گەش وی پی تاری بی

د کـانـوونـا نـە شـەهبازە  دەمـا کـو نـە بـهاری بی

داهی :

سـەلامـی هـەیـڤـا نـیـسانی  هـەژاندن سووسن ورەیـحان

تە چـەنـد غار رابوو بەردانی  ب وان غاران دبـوو فەرحان

چ خـوەش نەقشن ل دیـوانی  مەشینە هەر وەکی سەیـحان

بی خەو :

دەما گورگور ژ سەیحان تی  گەلـەك بازی دبن گـوهدار

دەم وچاخی کو پەروان تی  دچـی ناڤ ئاگـری دژوار

ل وی تـیـپـا ژ دیـوان تی  نە وان ئەز دبـم غەمـخوار

داهی :

ب وان نەقشی تە نەقشاندن مـەلائـك تیـنـە سـەیرانی
ئـەرض وئـەسمان تە هەژاندن تـە رەش ئانـی ل مـەیدانی
ژ وان تـیـریـژ تـە رژانـدن کـو خـەط دانـی ل دیـوانی

بی خەو :

ل دیـوانـی سـپ وسـارم دەمـا دیوان خەیالـی بی
ب دل تـاری ونـەیـارم ئەگەر کارەك حیالـی بی
بـی خـەط وخال وبیـزارم حەتا کـو نە لوئالـی بی

داهی :

دبیم خەططـی تە ئـەلـمـاسـن رەشـانـدن زیـر ژ کـافـووری
ژ عـلـمـی مـەنـطـق قـیـاسن چ جەوهەر بوون د ناڤ نووری
د ناڤ دووران دە خوەش ناسن شـەفـەق دایـە ل سەر طـووری

بی خەو :

نە مووسا بی ل دەر طووری نـکـاری شـوعلەیی هلدی
کەسی وەك من حەتا گۆری نـکـاری راگـری فـنـدی
کـو یەك نادی یەکی دۆری ژ ڤـر تـا کـو هـەری هندی

داهی :

شەفەق چوو چین وماچینی گـەلـەك پـی هاتـنە ئیمانی
خـویـایـە ڤـا ل قـەزویـنـی د بەحری عقدی مەرجانی
هـەژاندن وەرد ژ نەسرینی د ناڤ باغی گـولـستانی

بی خەو :

د ناڤ باغی گـولـسـتانی ژ رەنـگـی بـلـبـلی ژارم
ب دەردی مـن خودا زانی ژ مـیـلاکـی بـریـنـدارم
د ناڤ دوومان وپیـتخانی نـە نـیـسـان ونـە ئادارم

داهی :

د ناڤ باغا گـولـەك دەربـوو — تــیـــریـــژا وی چ دژوارە
ل دونـیـایـی سـەرانسەر بوو — هـوجـووم دایـە ل سەر دارە
ئەری عشقەك ژ دل دەربـوو — ژ لـەو سەلـمان بوو سەردارە

بی خەو :

دەما سەردار بوویـی سەلـمان — فەلـەك راست ونە خاییـن بوو
ئـــەســـەر دابوو ل سەر شاهان — ل ســـەر ئایـیـنـا ئاییـن بـوو
ب هاواری عـــەلـــەم هـلدان — قەلـەم سەر صەفحە زەرین بوو

داهی :

ب وی عشقی قـەلـەم کیشا — ژ بـی خـەو رە شیاندی وی
ل طـالـع بـــۆ مـە دەرویشا — ل دونـیـایـی گـەراندی وی
نـەظـەر دایـــە بـریـن ئیشـا — ل وی دل بوو حەلاندی وی

بی خەو :

ب راستی دل حەلا وچوو — نـەما کـاتـە بـدی جارەك
ئـەسـیـری دەر قەلایا بوو — دی چاوا بی ژ من کارەك
یـەتـیـم ورەنگی کالا بوو — دخوازی تو نوو سووارەك

داهی :

دبیم بـی خەو چ سووارە — ل مـــەیـدانـا مـەم وزینی
ژ عوششاقان رە سەردارە — ژ ڤـر تـا بگهی قـەزوینی
بەلـی ئـیـرۆ مە دل سارە — وەکی فەرهاد وشـیـرینی

بی خەو :

کـــو دل سارە ژ تـاریـــتـی — گـهـا گـــۆری نـــەزان وژار
بـهـار هـات و ژ هـاریـتـی — نـەدی مـە سووسن وگولزار
ب ســەد رەنـگـی نـەیاریتی — ل عیدان ئەم نەبوون گوهدار

داهی :

مه گـۆ : عـیـدا ته پـیـرۆز بی　　　د عـیـدی هوون خوەشی بینن
ل پـەی وی جـەژنا نـەورۆز بی　　　د نـاڤ دە ســووسـنـی شینن
کو سال حەمیی دە یەك رۆز بی　　　دو سـی رەنـگا ژ خوە رە بینن

بی خەو :

دزانـم سووسن ورەیـحـان　　　بـــهــا تـــیــنــن ل بـازاری
ل دەسـتـی جندی ومەردان　　　د بـیـسـت ویـەکی ئاداری
کـو دل صافی نەبی حەیران　　　ئیش وژان ناچی یەك جاری

داهی :

بـــەســـە داهـی تـو بەس بیژە　　　ل بـــی خـــەو تو سەلامکار بە
دلـی خـــوە تـــو نـەئـاڤـیـژە　　　ل پـــیـلـی مـایـی گوهدار بە
مـــیـــلاکـی خـوە تـو نەبریژە　　　نە غەم لـەیس ونـە سەرسار بە

بی خەو :

ژ رەنگـی سەبعی سەییارم　　　چـهـار چـونە سسی مانە
ژ هەر ئالـی ڤە ئەز چارم　　　ســەلام سەر چاڤا هیژانە
غـولامـی داهـیـی ژارم　　　ب ئـەرزانـی مـە بەردانە

تم الجزء الأول بتاريخ ١٧ تشرين الأول ١٩٥٥ م ، ربيع الأول ١٣٧٥ هـ
ويليه الجزء الثاني والثالث

( ٦٥ )

# دلۆپا بیست ویەکی تشرینێ
# فەقیر وژارا دخاپینێ

دبێـژم ئـەی گەلـی گـوهدار          بـووبـوو هـەووارە دلۆپی
شـەڤا تـشـریـنـێ بـوویە سار          چـكـو غـەددارە دلـۆپی

هـەزار ونەهـ سەد كو چووبوو          شێست وسسێ مە گۆ زوو بوو
نـیـڤـا پـأیـیـزێ بـو رێ بوو          سـەلام هـەر كـارە دلـۆپی

بیست ویەك چوون ژ تشرینێ          مـەلـەكێ رەعـد عەورا تینێ
ئـەز رازا بـووم ناڤ نـڤـینێ          نـزام غـەم سارە دلـۆپی

دلـۆپ هـات و دنـقـتـی          كـو جـهـ جـهـ ئـەو دلەبتی
ژ ئاڤـێ كـەس نـەتـەبـتی          چـوو بـن دیـوارە دلـۆپی

نـزانـی مـن خانی بـوو ئاڤ          ژ خـەو راببووم مە دابوو ناڤ
نـە بالـكی هشت نەما گولاڤ          دەردێ پـێ چـارە دلـۆپـی

نــه هــەوار ما نــه گـازی مـا　　ل بــەر سـەرمایـیٚ طـازی مـا
ب دل ئـیٚـش وشـکـەسـتـیـمه　　چ خـــوەش هـشـیـاره دلۆپـی

د خـیٚـنـی ده هـات ومـەشـی　　دچـی ئـەو تـیٚ ب دل خوەشی
ل وی داوەت شـەڤـا ڕەشـــی　　گـــەلـــەك دژواره دلـــۆپـــی

نـکـارم ئـــەز بـــکـــم هەوار　　نەچوو نچ ئەو دلۆپ تیٚ خوار
مـــه لـیٚ نـیٚـڕی کـو ئاڤا سار　　لـــەهـــی ســـەرداره دلـــۆپی

دلـــۆپ ڕابـــوو ب کار وبـار　　ژ ســـەر خـیٚـنـی دهاتـی خوار
گـەلـەك هـاتـن ئەو بیٚ هژمار　　نـــزام نـــەیـــیـــاره دلـــۆپـــی

هـیـڤـا هـاڤـیـــنـیٚ خـاپـاندم　　تـــشـــریـنـیٚ ژی نـه ترساندم
بوو بیست ویەکیٚ ئەز بـزداندم　　چ ئـــــژدەهـــاره دلــــــۆپـــی

دەمـا مـــن دی دل م کـول بوو　　جـــل وبـالـگـی حەمی شل بوو
ل ســـەر خـیٚـنـی ئاخ وزل بوو　　بـــەلـیٚ ڕەشـــمـاره دلـــۆپی

ژ ســـەر خـیٚـنـی حـەتا دیـری　　حـەمی بوو ئاڤ وهات جیـری
ژ ســـەرمـا مـن ژی لـیٚ نیٚڕی　　هـاویـــر بـــەرواره دلـــۆپـی

نـــیـــڤـا شـــەڤـیٚ لەهی ڕابوو　　مـا ئـــەز چ بـکم خودا دابوو
شـــەڤ تاری بـوو ڕیٚ وندا بوو　　دابـــوو نـــەعـــعار دلـــۆپـی

نە هێڤیمە نە گازیمە ب ئەمرێ ودا رازیمە
ژ ناڤا دل شکەستیمە نە گونەهکارە دلۆپی

دلۆپ هات وتەخسیر نەکر د خێنی دا شوغولێ خوە کر
بێ ئەمرییا خودا نەکر نە کو سەرسارە دلۆپی

خودا ئەمرێ وی کربوو هات خانی ل من کریە فورات
نەما صەبر ونەما تەبات ژ نوو زارزارە دلۆپی

حەچی هاڤینی رازابی نوو پاییزی ژ خەو ڕابی
شوغل وکارێ وی یێ هابی ب سەد هەزارە دلۆپی

ژ ڤر پێدە کارا خوە کم ل شوغلێ خوە تەخسیر نەکم
سۆز بی ژ کەس باوەر نەکم ببم گوهدارە دلۆپی

کەسی جهاد نەکی هەر ئەو دژمن ژ جه نەکی دەر ئەو
نەبی وەك سەد گولێ زەر ئەو کەڤی بن دارە دلۆپی

دلۆپی دونیائێ هانە ل ئاخرەتێ کا چاوانە
هەزار جار زەحفتری وانە مە دل کار کارە دلۆپی

دلۆپی دونیائێ هەدنی ب پۆش وحەرری سەکنی
د تربێ وێ بێ ڕێ نەدنی قیامەت نارە دلۆپی

چ بێژم ئەز هوون تەڤ ڕابن		دلۆپا تربێ گوهدار بن
شەڤ ورۆژێ لێ هشیار بن		نەبن غەم سارە دلۆپی

ژ ترسا من تەبات نایێ		ل دلۆپی کەتم تایێ
ل هەوار من کەسەك نایێ		ما تو نەیارە دلۆپی

حەچی گوهدار بی فێهم کریە		تشتا هەی وی سع کریە
ڤایە ساغە نە کو مریە		ملا سەردارە دلۆپی

بەسە داهی تو بەس بێژە		ل دلۆپی ببە گێژە
دلێ خوە تو نە ئاڤێژە		زانن خوسسارە دلۆپی

( ٦٦ )

## دلۆپی هەی هەی دلۆپی
## تە دەست دانی سەر تۆپیێ

سـالا هــەزار ونــەهـ ســـەد — شـێـســت وسسیێ هەی مەدەد
هـەیـڤـا تــشــرینــا ئەووەل — بــیـــســت ویـەکـی کەتنە دل
کــولـیێ زەحــف وگـرانـــن — ئــەو دلـــــۆپ وبــارانـــن
بوو عــەور وشـەڤ تاری بوو — خــانــی ژی نــە دو ویـبـوو
دەنــگــیێ مــەلـەکی رەعدە — چـــەپ وڕاســت عــەور بادە
عـــەوور کـــەلـی باران هات — حـــالـیێ مــە بــوو کـیفەرات
دلــۆپـا ئــەووەل نـــالـــــی — مــە ژی خـــوە دا یـەك ئـالـی
دلـــۆپ هـــاتـــی بیێ مـەفەر — ژ وی جـــهـــی کــرمـــە دەر
ئەز ڕابووبووم ب سەربـەست — ژ وی جـــهـیێ خـوە گوهەست
دلـــۆپـــی هـوجـووم دا مـن — ئـــەو هـــات وڕیێ نـــەدا مـن
ئـــەز ڕابـــوومـــە ژ پـــیـیـا — قـــەســتـا تـــەختـی کـریـیا
ل ســـەر تـــەخـتی ڕیێ نەمـا — دلـــۆپ هـاتـــی وەك چـــەمـا
ســـەر خـێـنـی گـولـە ئاڤیێ — مـــە ئــەڤ حـالـیێ هـە ناڤیێ
ئـاخ نـــیــنـــە بـۆش رزییـا — دلـــۆپ بـــوویـــە کــانــییـا
ژ فـــەقـــیـــری ونـــەزانـــی — هـــاڤـــیـــنـی خوە پێـك نانی
مـام حـــەیـــیـــری فـکـــرم — ســـەر حـــالـیێ خـــوە دگـــرم
مـــن گـــۆ دلـــۆپـا تـــازە — نـــەوە تـــشـــکــی بـخـــوازە

ئەزێ بدمە تە بەرتیل　　عەفیەت بی بۆ تە بێ حیل
دلۆپێ دابوو جەواب　　ئەز هاتمە تە بێ عتاب
ئەو هاتە من بێ غەمە　　گۆ ئەز مێهڤانێ تەمە
ڕابە کارا خوە بکە　　نەوەرگرە شمکە
ئەزم دلۆپا دینم　　یێ وەکە تە دترسینم
ڕابووم من لەمپە گەش کر　　من ووی شەڕڕەك خوەش کر
من دانیبوو بەر لەگەن　　گۆتی چ بکی ئەی ڕەبەن
دەربەك دانی سەرێ من　　ترسا وی کەت دلێ من
ئەو هاتە من بێ مەفەر　　ژ سەر تەختی کرم دەر
جل وچە تەڤدە شل کر　　دلێ مە نووڤە کولکر
ئەز چوومە مەنزەلا دی　　ل ور دلۆپ وبادی
دلۆپی گۆ تو وەرە　　تو عەلمیە بینە دەر
ئەز دلۆپم نەناسم　　ل مەیدانێ مێرخاسم
دەربا من پوڕ گرانا　　یا بەطل وپەهلەوانا
دلۆپ ل من فتلی　　ل مەیدانێ کەملی
دلۆپ دکی پێ کولی　　گۆ بنێرە تو ل گولی
هەوارە وی دهاتن　　ئەو دجلە وفوراتن
عەسکەرێ وی پوڕ زەحفە　　ئەز دابوومە بەر تەحفە
هەوارا وی پوڕ بۆش بوو　　یا من تەشت وبەرووەش بوو
ل من دا شوور وخەنجەر　　ژ وی دی ژی کرمە دەر
دەربێ وی تووژ ودژوار　　دانینە من بێ هژمار
دلۆپی حەیرانم　　ناڤا خێنی گەڕاندم
یەك ل مل ویەك ل سەر　　من ژی فراغ دانین بەر
فراغ هەمی داگرتن　　جلێ حەربێ وەرگرتن

بێ مەیل وهەم بێ گازن　　ژ تە حەربێ دخوازن
چقاس من ناڤێ خوە دا　　دلۆپی ڕێ بەرنەدا
من دەرب دانی وی دانی　　ل من تەژی بوو خانی
من خوە ژێرە کێم نەکر　　عەسکەرێ وی زێدە کر
چادر سەر خێنی دانی　　شوورێ مصری هلانی
من شەڕ کر فەیدە نەکر　　ل حێف ب سەری خوە دە کر
شەڕێ وی پوڕ گرانا　　نە وی ب سەر نەزانا
هاتن خودانێ خێرا　　دەست دان ملهێب وبێرا
خانی ل من صیاندن　　دلۆپ ژی ژێ قەتاندن
حەتا دلۆپ وەستییان　　کەزەبێ من قەتییان
وەختێ دلۆپ سەکنی　　دلێ من نوو هەددنی
هاڤینێ شوغول کار بن　　ل پاییزێ شیار بن
بکن کارا زستانێ　　هەڕن ناڤا مەیدانێ
هەڕنە شەڕێ دلۆپێ　　بگرن نیشانا تۆپێ
دەینێ دە شوور وخەنجەر　　کا دلۆپێ ناکن دەر
تا بی کولان د خێنی دە　　یا کێم دەربەك ل سەرێ دە
بازارا وی درێژا　　نەهشت جهێ لمێژا
دلۆپ نەما کو وەری　　وێ ژ سەر چاڤێ مە هەڕی
ئەڤ خەبەرێ مە گۆتن　　دل وجانێ مە سۆتن
مەعنا وی گەلکی کوورە　　داهێیێ مە ڕێ دوورە

ل سالا ١٩٦٣

( ٦٧ )

# ژ ره‌مزا دلبه‌رێ

ژ ره‌مـــزا دلـــبـه‌رێ زولف وێ دپـێـچا
مـــه دی هـاتـی ژ بـالـه دا قـه‌لـیـچـا
دمــه‌شـهـا بــوو وه‌كـی كـارا غـه‌زالا
ل پـه‌ی ئـه‌م چـوون دا ئـه‌م بن ده‌ریچا
مه دی سه‌كنی د ناڤ به‌غچێ گولا زه‌ر
ده‌ری كانـیـێ ئـــه‌وی زولفه‌ك دپـێـچا
مـه پـــورسی بوون دسی كه‌لام ژ دلبه‌ر
جـــه‌واب دا زوو دگـۆ پـورسا ته هیچا
مه گـۆ ئه‌م پورِ دنالـیـن ( یا حبیبي )
دخـــوازن ئـــه‌م ژ ته ئـیـرۆ دســـی چا
بـــده داهـــی ژ لوطـفـا خوه قه‌داحه‌ك
تـــو زولفێ خوه ل نك نه‌ذیر بـپـێـچـا

## ( ٦٨ )
# نە ئەز ئاڤم نە گیامە

نـە ئـەز ئـاڤــم نـــە گـیـامـە نـە ئـەز خاكا ل بـەر شووڤـم
نـــە حـەیـوانـم نـە ئـەز دینم د دیــوانــی دە مـەعـرووفـم

نـە ئـەز فـعـلـم نـە فاعل بووم نـە مـەفـعـوولـم نە موضافم
نـە مـەكسوورم نە مـەجروورم بـەلـی مـــونادی مەحذووفم

نـە مـــەحـذووفــی ب یائـیمە نـە مـەجزوومی ب جەزمیمە
نـــە مـەنصووبـی ب نـەصبیمە د سـەطـرا ثانـی مەوصووفم

نە نیرگز بووم نە چیچەك بووم نە عەنبەر بووم نە ئەز عوودم
نـــە كـافـــوورم نە رەیـحانـم بەلـی مەحبووبكی مەئلووفم

نـــە زۆزانـم نـــە گـــەمـیـانـم نە سەیـحـانـم نە جەیـحانـم
نـــە ئـــەز فـــوراتـی شامـیـمـە د بـــەریـــی طایی خەرنووفم

نـــە فـورسیمە نـە هـــنـــدیـمـە نــــە كـەشـشافی حجازیـمـە
نـــە ئـــەبـــدالـــم نـە ئـەخیارم د سەعی وعومری مەكشووفم

نــه ئـهز بـۆمـم نـه ئـهز كوندم        نـه ئهز عهنـقـايـی پـور رنـدم
نـه هـودهـود بـووم نه باشووكم        بهلـی وهك خولقی مهوصووفم

نــه شــيــخـم ئـهز نـه مـهلامه        نــه ســهيــيــدی ب فعلامه
د عــشــقــی داهــیيی دينــم        نــهذيـری عومری مهقطووفم

( ٦٩ )

## نه ئەز ئاخم نه ئەز باغم

نــه ئەز ئاخم نه ئەز باغم — گــەلـەك دووری ژ بەلامە
نه مریــمــه نــه ئەز ساغم — ب دل سـۆرگـولا مەلامە

نــه ئــەز شیخی بەرر پیمه — نه رووڕەشی د قەبریــمــە
نــه هــەتکی‌یی عەرەصیمه — بــەلــی مـوحبکی چیامه

نــه ئەز حوبرم نه کاغەدم — نه ئەز عارفی ئـەبـجـەدم
نه ئەز یەخسیری جەمەدم — د ناڤ حەوەنگی ضرغامه

نه ئەز جانم نه ئەز پـیـرم — نــه ئــەز دیـباج وحەریرم
نه مەحبووسی بنی بـیـرم — ب دەورانـــی د دل بامـە

نـــه ئــەز دینم نه درستم — نه ئەز بۆمی ل بەر بەستم
نــه گرتیمه نه سەربەستم — نـزانـم ئـیـرۆ چـاوامـــە

نــه ســەعیدم نه ئەز عارم — نه نەججارم نه توججارم
ئــەمــان جانــی تەوبەدارم — د ناڤ عشقی دە وندامە

نــه صووفیمه نه حاجیمه — نــه وەلــیــمه نه غەوثیمه
د عشقی دا نــوو داهیمه — نەذیـر دل سطرنج ودامە

( ٧٠ )

# مه دی جارەك

مـه دی جارەك دهـاتـــی نـك مـه دەرویش
مـه گـۆتـی پـور كـەرەمكه تو وەرە پـیـش
وی گــۆتـــه مـــن عـەزیـز نـەبـه غافل تـو
ب رۆژ وشـــەڤ دونـیـا ژ بـۆ مـه دل ئیش
ته دی هاتن دو سی شەخص ئەو ب هـەڤرە
یـــەكـــی گـــۆتـی ژ بۆ وە خۆ ددم پـیـش
ئـــەزم ســـەروەر ژ بـــۆنـا وا حـــەمـی‌یـان
د جــڤـاتــی یـەكـی گــۆ ئـەزم سەربیش
یـــی دی دگـــۆ ئـــەز نـــه غـولامـی وەمه
قـەبـوول ناكـن سەروەر وەك ئامری جیش
هـــەنـــه ســـەروەر ژ بـۆ چـڤـاس حەیوانا
ژ طـــەیـــرا هــــەم ژ قـطـكـه حـەتا میش
ژ ئـــنـــســانــا رە ژی ســـەروەر پـور هەنه
ژ ئـاغـاوو ژ گـاڤـانـا ژ قـــــــەریـــــــش
د نـــەفـسـا خـوە هـەر یەك ژ وان كوبارە
یـی تـالـی سـەروەری كـەسی بچیت ئیش
گـــەلـــەك هـــەنـه ژ بـۆ وە ئـەز نابـیـژم
بەسه ئەڤ ئەو ژ بۆ كەسی قـەلـوونـكیش

ئـــەگـــەر بـيـــژم ب مـــن هـــوونى بکەنن

ژ بـــۆ مـــن هـــوون تـــەڤـدە ببیژن شیش

حـــەچـــى رازى ب ڤـان شـــعـــرا رازيـه

حـــەچـــى نــــەرازى بـى بـلا وەرى پیش

بـــەســـه داهـى دريـــژى قـــەط نـه لازم

نـــەذيـــر دونـيـا هەروهەر بوويە دل ئیش

( ٧١ )

# ئاه ژ بەر جەور وئەڤینی

ئـاه ژ بــەر جــەور وئـەڤـیـنـی حەلیا بـوو تـم کەبەد
نەقش وخەططــی کو ل بەژنی مەصنووعی رەببی ئەحەد
ظـاهــر ومــەظــهــەر د مـەعـنـا باطنی هەر دو یەکن
گــەر نــزانــی وەر بـنـیـره ئـسـمـی ئەللاهی صەمەد
ئــەڤ چ مــەعــنـا ظـاهــره عالم ب دەڤ مەعنا دکن
مــەعـنـا ئـعـجـازی د بـاطـن بـی حساب وبـی عەدەد
بیست وپینج وەجهن ژ بــۆ ئـسـمـی جــەلالـی هاتـنه
هــەر یــەکـی هەفتی وپـیـنـج مەعنا ژ بۆ وینه ب عەد
عـالـمـی ئــەهــلــی زەمـانــی ظـاهـری مـەعنا دکن
بــەس نــزانــن مـەعـنـا باطـن تا بـچـن بورجا ئەسەد
گــەر دڤــی مــەعــنــی بـزانـی تـەفـەکور دائم بکه
ضــەرب وجـەمـعـی لـی بـده دا تـو دەرینی ژی زوبەد
وەیــه داهــی کـەس نزانت ضەرب وجەمعا ته ب خوه
تــەکــەســور بـیـتـه حـوروفـا قەولـی ته نابت فەنەد
نــەذیــری داهــی بـبــیــژه ئــظـهـارا مـەعنا نەکه
ژ ئــەووەل ڤــه تــه حــەلانــدی دل ومیلاك وجەسەد

( ٧٢ )

# رەببی ژ خەطائی

رەببـی ژ خـەطـائـی چـیـبـوونـە كەدەر

ئـــەم مـان بـــی ســـــەروســـەر

نینە د دەستی مە قورووش ویەك مەجیدی

ب مـلـیـوونا تـە دا مـەجید ئـەصفەر

وەلـــلاه حـەسـەدی ژی نـاهـلـینـم

زانـم حـاسـده ( هـو الأبـتـر )

بـەلـی دخـوازم ئـەز ژ حالـی تەنگی

سـەد لـوءلـوء ومـەرجان ومـەرمەر

ئـەز رازیـمـە ب ئـەمـری تـە ئیلاهی

وی نـەقـلـە ژ فـورقـانـی د دەفتەر

باوەریا مـن ب دەلیلا ( نـحـن قـسـمنا )

( مـن لـم یـؤمـن فـقـد كـفـر )

( نـحـن قـسـمـنا بینهم ) بوویە دەلیل

بـی شـەك وشـوبـهـە دەلیل تینم سەر

یا رەب تـو خـوەش بكە حالـی فەقیـرا

سـەد حـەیـفـا ژ جـڤـاتـی چـوونـە دەر

ب ڤـی حـالـی نــەمـایــە قــەط خاطـر
لــــەومــا ئــــەم ولـی خــوە ددنـــە دەر

دل شـــەوتـــی ژ بــۆ وا ب ڤـی حالــی
داهـــی تـــە نــەمـایـــە قــەط مـەفەر

بــەس زیــدە کـە فـکـرا خوە تو نەذیر
ئـــەم مـان حـــەیـیـری د شـوغلی ئازەر

( ٧٣ )

## ئاه دلبەری ما وی وەری رەنگی بەری ؟

قـەط مــە نــەدی بـەر بـی خـوەدی ناکم فدی کال بوویە ئەو
عــشـقـی رەڤـانـد دل هـەررشاند نووڤە کەواند حال بوویە ئەو
ئــەم گــەرریـیـان سەر سەر چیان چوون بەرریـیان نوو بژیان
جان وجــەگــەر دل بــوو سـەقـەر نووڤە تەڤەر ئال بوویە ئەو
دی ئــەز چ کــم نـالـیـن دکــم دوعـا دکـم خـوە بار بکم
باری وەبـوو بــی فــەیــدە بـوو نـوو زیـدە بوو نال بوویە ئەو
هــەی هـەی فـەلـەك بـوونە گەلـەك تووڤە مەلـەك هاتن خەلـەك
دوررا حـەجـەر وا دایـە دەر ئەز چـووم سەحەر عال بوویە ئەو
ئەز مەی فرۆش نەمان ل هۆش ما چوونە بۆش ئەو هەر ل قـۆش
دیـسـا وەریــن دا ئــەم هــەریــن لـی بگەرین مال بوویە ئەو
وی کـەوکـەبـی ناڤ بـەغچە بی خار بەر هەبی بیژ بەر مە بی
رەنـگـی ل سـەر ئەو سۆر وزەر مەرمەر حەجەر خال بوویە ئەو
خال نووری بوو سەر سۆری بوو پور دووری بوو دل بۆری بوو
کـەت غـەرغـەری ما وی وەری رەنـگـی بەری فال بوویە ئەو
عـشـقـا مــە هــەر مـایـە ل سـەر وەقتی سەحەر کو بیتە دەر
پـەریـا رەقاص بـبـت غـەواص ئەز بووم قصاص قال بوویە ئەو
پـەریـا جــەمـال مـایـە قـبـال تـیـسـی ب خال نـیـنـە مەجال
ژ بــۆ نــەذیــر داهــی فـەقـیـر بوویە ئەسـیـر لال بوویە ئەو

( ٧٤ )

# دلبەر تەنی ئەبجەد تەنی

دلـبـەر تــەنــی ( ئـەبـجـەد ) تــەنــی دا مـن تـەنی خالا چیا

ئــەز چــووم ب بـەز نـیـنـە ( هـەوەز ) حەلیا بوو بەز پالا چیا

( حـوطـی ) نـیـنـە دل بــریـنـە بـوویـە خـوینە تـم حـەزیـنـە

ســەر ( کـەلـەمـەن ) ئـەز بـووم رەبەن نیڤ دارا بەن عالا چیا

بـەر بــەغــچـەبـە یار کـەوکـەبە کەسك غەبغەبە چوو حەلـەبە

( ســەعــفــەص ) دڤــی قــەط نانـڤی وی گوڤگوڤی کالا چیا

( قـەرەشـەت ) هـەیـە نـە ژ بۆ مەیە رەنگ زیدەیە ئەو هەر وەیە

کـانــی ( ثــەخــذ ) ئــەز بــوومــە دز دل بـوویە جز دالا چیا

( ضــەظـغ ) وە بـوو نـە ژ بۆ مە بوو بی چارە بوو طەبیب نەبوو

ژ بــۆ عــەلــیــل بــوویــە ذەلــیــل نـیـنـە دەلـیـل ئالا چیا

ســالا غــەلا بــوویــە بــەلا ئــەز بــووم مـەلا مـن گــۆ کەلا

نـائــی ب مــەش ئــەو قـەوسـی رەش بـەژنـا کـەلـەش خالا چیا

خـالــەك زەرە دیــــم فـەنـەرە خــەد ئـەنـوەرە هات پـەنـجـەرە

رۆژی هــلات ئــەز چــووم خــەبـات دانــی جـڤـات پـالا چیا

من دی ب خەف هەر چار طەرەف تین ساس ودەف خوونا نەجەف

نـاڤــدە بـــژی دل کــــەوژی بـــــوویــە رەژی فـالا چـــیـا

ئــەڤ چــەنــد خـەبـەر گۆتن سەحەر کول دانە دەر داهی مەفەر

ژ بـۆ نــەذیــر نـابــت جــەدیــر بـوویـە ئەسیـر عالا چیا

( ٧٥ )

## مە دلبەر دی دەما هاتی

مـە دلـــبــەر دی دەمـا هـاتـی ژ بـالا ئـەو ل بـەر ژیری
چ خـوەش شـەوق وشەمال پیرە دسكەنیبوون ل بەر دیری
گـریـــدە چـیچەكی زیڤ وی ل سەر زولفا مە لـی نیری
خـەبـەر دا بـوو تـەبـەسسوم كر گو رابە تو ئەگەر میری
گـــریـــدە تـاجـا سـولـطـانـی ژ نـوو دەینە ل سەر سیری

مـــە گـــۆ دیـــســا زەمـانـــی مـە نـە زەمانی وەكی دارا
ل دل كـــەتـیـە دو سەد داغ ئەو بەلـی چ بكم برین سارا
نـكـام رابـــم ئـــەڤـی دەوری ئەمان رۆژ چووبوو ئـیڤارا
فەلـەك دیسا تو گوه بـدیـی كەسی راست ڤی وەخت عارا
هـــەر وهـــەر ئـەز ب دل بـەطلم غەریب نابی فعل خیری

ژ بـیـر نـاكـم ئـەڤـی تـاجـی حـەتـا بـمـرم فـكـــردارم
ل سـەر دەربـا شـیـریـن تـاجـــی ژ مـیـلاكـی بـریندارم
دكـــم گـــازی ب دل راسـتـی ب ڤـــی قـەلـبـی پلندارم
د ظـــاهـر دە ل نـك خـەلقی شەڤ ورۆژی چ رەشـمارم
( سلام الله ) ل سەر دەستا كەسی كو بی تو خوەش زیری

نـكـارم ئەز تەحەمـمـول كـم د دەهـر بی ڤی تاجا شيرين
ب دل صافيمە سەد جاری د باطـن دە ئـــەزم غـەمـگـيـن
د ظـاهــر دە ئـــەزی ديـــنـــم د عـشـقـا فەرهاد وشيرين
بـــلا ســـەد جـار جـاهـل بـيـژن تويـی مونكر ژ بۆنا دين
ئـــەگـــەر عـشـقـا ئيلاهی بـی تو گوه نەدوان تو جاميری

ســـەراســـەر ئـەهـلـی دونـيائـی دبوون عالـەم ب دەليلـە
دەلـيـل ئانـيـن ژ قـــورئـانـــی ژ بـۆ جـيـهـادا سـەر نيلـە
نـاكـــن عـــبـــرەت ژ بـــۆنـا خوە وەكی هاتی ل سەر فيلـە
د نـاڤـا وان دە ونـــدامـــە مـــە گـــوه دايـــە قـال وقيلـە
جـــهـاد نـيـنـە ب راسـتـی قـەط چ بـيـژم ئەز هەيا خيری

بــەســـە داهـــی چـــقـــا بـيـژی كـەسـەك نابی هەڤالـی تە
دە كـا بـــيـــژە ژ بـــۆنـا چـی چـمـكـی نـيـنـە سەوالـی تە
ژ صـــوبـهـی حـەيـا ئـيـڤـاری گـەلـەك كول كەتنە دلـی تە
مـــەلا تـو ل كـوو دلـی تـە ل كوو نەذير چوويە چەوالـی تە
ب شەڤ دز بە ب رۆژ صووفی دی چاوا تو ژ خودی دويری

# فەلەك جارەك مەدی هاتی

فـەلــەك جـارەك مــە دی هاتــی ئەفەندی
بروو قەیتان وی چاڤ رەش نـوورا هندی
ل مـــەیـــدانـــی دبــوو ظاهر شەڤ ورۆژ
مە زانیبوو بـەنـم یـا نـیـــنـــە گـــەلدی
بــی هش بووم وەك بەهرام شاهی ل غورفا
نـــەقـش سـنـمـار نسرین بۆشە لەوەندی
دلــی وی ســـەد ئـاه وكـەسـەر لیدابوو
ب حوببا لوقمانی وا خـەطـطــی جندی
وەیـا حـوسـنـی پـــەری بـــەدرا خوارزم
دوروســتـــی ساسانی قەلبی وی یاندی
هـومـایـا قـەیـصـەری داغـــەك ل دل دا
ب خـەطـطـــی عالــمی نوجوومی رندی
د غـــەربـــی دە ئـــزریبوون هاتە شەرحا
وی كـتـابـا تـاریـــخ هـاڤـسـتـە زەندی
سەبەب بوو یەزدەجەرد حوكمی دوعائی
ژ دونـیـایـی رەڤــی نـوعـمـان وكەندی
ژ نـــووڤـــە ئاگـــرەك هـاتـــە دلـی مـن
ل دونـیـایـی خـەططـــی سنمار حەباندی
بـەسـە داهـی تـە دل بـوویە موصەووەر
نـــەذیـــر وەك وی دبـوو عاشقی جندی

( ٧٧ )

# فەلەك كەتمە د حزبی دە

فەلەك كەتمە د حزبی دا — ب ڤی قەلبی نوو جەوهەر بووم
جهانگیرم د بەندی دا — عاقلمەند وموعەططەر بووم

د ڤی بەندی عاقلمەندم — د سولوی دە چ خوەش فندم
ژ ڤر پیدە چ شاب مەردم — د ناڤا عوود وعەنبەر بووم

د دونیائی دە وندا مە — د عشقی غەوثی غەیدا مە
( في بعد الموت ) ئاغامە — ژ نووڤە دی سەراسەر بووم

د عشقی دە سەراسەر هات — ژ یەثربی چ مەرمەر هات
ژ كاتبی خەطی زەر هات — بەلی ئەمما موحەییەر بووم

موحەییەر بووم شەڤا ئینی — ل سەر وی عەقدا پەروینی
وەكی صوورەتی نەسرینی — نەكو صوورەتی ئازەر بووم

ب ئایاتی ئیمان تینم — د عشقی دە ئەزی دینم
د بوغچە نیرگزا شینم — د شەرحان دە موسەططەر بووم

موسەططەر بووم د ناڤ نووری — موئەخخەر بووم ل سەر طووری
موهەددەر بووم ل مەكسووری — د قبلی مسكا ئەذفەر بووم

چ مسكه حووری‌یان تانی　　ل بەر چاڤی مە ئەو دانی
ب رەوحانی دچووم بانی　　د دیوانی دە ئەز وەربووم

د دیوانی مەلەك دینە　　ب صوورەت ئەو نوورانینە
د ناڤ بوغچی گولی شینە　　ژ توففاحان سۆر وزەر بووم

دنالم ئەز ل بوستانی　　وەكی سووسن ل نیسانی
ل بائی راست وچەپ دانی　　ل سەر بوغچە گولا زەر بووم

خەبەر دائی ب شەڤ هەردەم　　ساعەت یەك تا بسەكنم جەم
ل دل دانین كول وهەر غەم　　مە زانی نوو ب دەفتەر بووم

بەلەنگازی ددی من دی　　ژ بۆ شەوق وشەمال فندی
بنیر پەریی ل گۆڤەندی　　د عشقا وان موصەغغەر بووم

موصەغغەر بووم ( یوم الخمیس )　　د عشقا وی نەبی ئدریس
بەلی هاتن دو سەد ئەنیس　　د وی وەنسی مونەووەر بووم

د سەطریدە موشەووەش دی　　ل بەر چاڤا بەری رەش دی
د قبلی دە مونەقەش دی　　نەكو ساقی‌یی كەوثەر بووم

فەلەك داهی د عشقی هات　　دەما دلبەر ژ شەرقی هات
نەذیر دلبەر ل بەرقی هات　　ب رووحانی نوو غەرغەر بووم

( ٧٨ )

## ئەز دچوومە پور سەمائی

ئـەز دچـوومـە پـور سەمائی من ددین شۆخ وشەپال
ئەز ل بەر وان چەرخیم نووڤە هەژاندن زولف وخال
ئاوریـن ئـــەسـوەد عویوونان دانە من نەقش وسوئال
گـوفـــت وگـۆتـن تو دبین ڤی دلبەرا ئەنوەر جەمال
نـــەقـــشـی وی هەر دور وئەلماسن حەبیبا پور دەلال

دیـن کـرم ئـەز دور وئەلـماسی ل قەطری جەننەتی
لوءلوء وکافـوور وعـەنبەر نەقش وصونعا قودرەتی
عـــشـقـا وا ئـــەز هـلفـراندم برمە ناڤا ظولـمـەتی
ئـــەز دکـم نـالـیـن وزاری وەی ل حالـی غوربەتی
پـــور جـەفـایـا مـوبـتەلایا ئەی هەوارە مەش غەزال

ئـەز ب قـــەلـبـی خـوە دبـیـژم دائما ئەللاە ئەللاە
عـاشـقـم مەعشووقا من پور زیدەکر سەد سال وماە
نـــووڤـە گازی کـر حەبیب وەر تو بنیرە هەر ل جاە
مـن دگـــۆتـی ئەز دخـوازم ( جنة الـمـأوی مثواە )
هـــەر دەمـا دلـبـــەر دبـیـنم ئەوی نوورا ( لا یزال )

جانی من هەر وەخت د عشقی رووز وشەب چوویە تەلەف
کوشتییی دەست دلبەرا مەرمەر حەجەر خاتەم صەدەف
ئەز د ناڤ خوون وەرتاتینم وەك برینداری نەجەف
من ددا ئاواز ودەنگا خوون برینان بوویە کەف
ئەز د عشقی موبتەلا بووم نووڤە تین فکر وخەیال

دل ومیلاکن د خوونی جانی من کەتیە ئەلەم
سەد شوکور حەمد وثەنا ئانی ووجوودی ژ عەدەم
موحبەتا ناڤی ل ئەحمەد مەعنەیا وی کەیف وکەم
عاشقی رەببانی حەق بوون رووز وشەب ئەو چوونە جەم
سەیر وکەیفا خوە ددانین بەغچەئی راسەر نەوال

من نەظەر دایە ل وان فنجانا شوربی دانە دەست
ژ ئەزەل تا ب ئەبەد جان ودلی من ئەو دخوەست
گول وسونبول وی ل خاران بەغچەئی رابەری بەست
سۆتنە پەروانی عشقی ئەو کرن سوکران ومەست
بوومە مەجنوونی ب لەیلا بۆ چنە ئەڤ قیل وقال

داکەتم ئەز ناڤا بوغچە من ددی هات یەك قەمەر
مەش غەزالە رەنگ نەعامە کوشتمە ئەز بی مەفەر
رەمز وتیریژی ژ نوورهی یەك ب یەك ئەو هاتنە سەر
من دنیری بوو ل بەژنی کەتنە دل خەنجەر وبەر
هەی هەوار وگازییا من رووز وشەب ئەو ماه وسال

رەمــز وتــیــریـــژا حـەبـیـبـا ئەو ژ رەمزا زیـدەنـە
ئــەو ژ بـالا هـاتـــنـە خـــواری چـوونە ناڤا چیمەنـە
فـەرع وعـوقـاصی ل سەر سەر دائم مەعشووقی منـە
دلــبــەرا مـــن چـوو سەمائی گۆ : وەرە دۆستی مـنـە
غـانـی ومـــوغـــنـــی دهـاتـن دائـمـا ژی مـیـم ودال

شەعلوول وبولبول د ناڤ دە هەر ل من بوونە حەبیب
ئـەز ب قـەلبی خوە دنالم حیستـری من بوون لـەهیب
گـــەر ل ســـەر عـشـقا حەبیبا بنڤیسم موغنی لـەبیب
وەصـفـی وان نـابـن تـەمام داهی ژ نوو ببمە کەئیب
ئـــەی نـــەذیـــر بـەس تو ببیژە قەط نینە بۆ تە مەجال

( ٧٩ )

# ئیرۆ دنالم رووز وشەب

ئیرۆ دنالم رووز وشەب — هیڤی دمام قاصد نەهات
هوور بوون ل من جەرگ وکەزەب — کەیفا مە بوویە کێفەرات

کەیف کێفەرات بوویە عەزاب — دل هوورکری بوویە کەباب
بەر چاڤێ مە بوویە سەراب — دائم دزێن نیل وفورات

نیل وفوراتێ جەنەتێ — هەر ئەو ژ صونعا قودرەتێ
حەتتا نەکن ئەم خدمەتێ — ئەم نابینن ناڤا جەنات

یا رەب دترسم ئەز تەنێ — سەد بەر وەرین سەر بەدەنێ
بۆ تالێیا مولکێ دنێ — مایە د دل شەکر ونەبات

نەگهام هەرِم بوغچەئێ رِەش — بچنم ژ ناڤ سەد گولێ گەش
یەکجار هوجووم بەژنا کەلەش — نادم هەزار سێسەد خەلات

سەد جار خەلاتێ دلبەرێ — خوەش خوەش مە دین رِەنگێ بەرێ
سەکنین د ناڤا پەنجەرێ — لەوما نەمان صەبر وتەبات

صەبر وتەباتا من نەما — دائم ب عشقێ حەوجەما
دل حەلیاندی پورِ غەما — یا رەب کەنگی بچمە نەجات

وەختێ مە دین حووری ومەلەك      سەد كول د دل دە بوون گەلەك
هەی هەی فەلەك هەی هەی فەلەك      كەنگی ئەوێ بن راضیات

عتاب نەكن داهی سەحەر      حوسنێ پەری بەدر وقەمەر
حجاب وپەردە دانە بەر      نینە نەذیر ما یەك خەبات

( ٨٠ )

## عومرێ مه چوو بێ فەیده

عومرێ مه چوو بێ فەیده چوو وەك خـەونـەكـی بـەیهوودەیه
نــووڤــه ژ دل نـالــیـن دچوو ئـاگــر د مــێــلاكــێ هـەیه

ئاگــر ژ مــێـلاك هـاتــه دەر پـێـتـا كـو هـاتــی سۆر وزەر
خـەو نـیـنـه تا بـێـتـه سەحەر دێ ئــەز چ بـێـژم هـەر وەیه

حــەیـفـا ئـەڤی عومرێ دەلال بــۆرانــدی مـــه دائم بەطال
هــوون گـوه بـدێرن یا هەڤال ڤـان خــەبــەرا ئەصلەك هەیه

عــومــرێ كو چوو نائێ دنێ هــوون ڕابـن تـەڤ گوه بدنێ
نـاكــن یــەقــیـن تـا مـرنـێ هــێ نــووڤـه ئـەو بێ فەیدەیه

ئـەجـدادێ مـه گـۆتـن خەبەر ئـەمـرێ خـودا بوو هاته سەر
ئـیـرۆ تـەنـێ مام بـێ مـەفـەر كـا هــوون بـبـێـژن نـەوەیـه

( قـال فـي الـحق واهـبـطـوا مـن رحـمـة لا تــقـــنـطـوا
فـي الـكـتـاب وهــم حطوا ) ئـەو خــوازییـا دلــێ مـەیـه

وەجــهــێ جـوانێ وەك هلال نــوو ڕەش كــری لعبا بەطال
ســۆزا بــدن دائـم كــەمـال حـسـاب وعــەذاب یـێ مەیه

سەد حەیف برا هوون ڕەش بن		ڕۆژا قیام بێ هش ببن
یان داخلێ ئێگر ببن		دێ ئەز چ بێژم زێدەیە

یا رەب داهی دوعا دکی		ڕۆژ وشەڤێ نالین دکی
ب وان پەرییا تو شا بکی		عشقا نەذیر دائم هەیە

( ٨١ )

## د هەیڤ وماهێ سالێ دە

د هـەیــڤ وماهێ سالــێ دە　　گەلـەك پورێ خەستەمە یا رەب
شوكرخـوازم د رەوضــێ دە　　ب نال ونـالــەمـــە یا رەب

دل ومـێـلاك كو تەڤ چوونە　　د عـشـقـێ چاڤ وئەبروونە
نـە یـەك هەیڤ ون یەك رۆنە　　نەخوەش بێ چارەمە یا رەب

فـەلـەك طـالع ل مــن عـارە　　ل مـن كـەس نابی گوهدارە
دلــێ مــن هــەر بــریـندارە　　ب دل نال وغــەمـە یا رەب

ل مـــن بـۆریـنـە سـال ومـاه　　ب رۆژ وشـەڤ ب ئاه وئاه
ل مـن رەحـمـێ بـكـە ئـیلاه　　ل دەرگـاهـێ تـەمـە یا رەب

ل دونـیـأیـێ خــوەشـی نینـە　　ژ بــۆ مــرنـێ جەواب نینە
د تــربــێ كـا هـەڤـال كینـە　　د دل ئەڤ هەر دەمە یا رەب

ســەرێ مـن كـەتـیـە بەلائێ　　دكــم نـاكـم هـەدان نائـێ
چ دل ئـێـشـن ل دونـیـائــێ　　د ناڤ دەرد وغـەمە یا رەب

ئــەزێ بــمـرم ب ئـاه وئـاه　　نـە یـەك رۆژ ونە سال وماه
د قــەبــرێ دە مـە نـینە جاه　　ب رەحمێ حەوجەمە یا رەب

د وێ قەبرا ڕەش وتاری    مەلائك تێن ب دژواری
گونەهكارم گران باری    ب نال ونالەمە یا رەب

ب جانێ من نەكر كارەك    وەها بمرم بچم جارەك
مشقال سەر من ببی بارەك    ژ لەو دل پوڕ غەمە یا رەب

چ بێژم ئەز ب ڕاستیمە    ژ ناڤا دل شكەستیمە
ژ بۆنا توربێ خوەستیمە    چ وەخت بی تالەمە یا رەب

ژ بۆنا توربێ خوەستیمە    ژ مرنێ ڕە دەرگستیمە
حەساب كە ئەز گوهاستیمە    نە كو سەد سالەمە یا رەب

ئەزم عەبدال گونەهكارم    ژ خێرێ ڕا وەكی مارم
ل دەرگاهێ تە زارزارم    ب گونها زانەمە یا رەب

ئەڤا بیست سال مە حال هایە    گونهێ بچووك مە چیایە
د ناڤ گونها دە پالدایە    ل گونها پالەمە یا رەب

دكم هیڤی ژ ئیلاهی    ب وی نوورا ل سەر ماهی
هنێ ژێ تو بدە داهی    نەذیر بێ حالەمە یا رەب

( ٨٢ )

# ل پەی گۆڤەند وڕەقصێ

دبێـژم ئـــەی گـەلـی گـوهـدار بنێرن

بــوویــە شـاهیـن وقیـر وسەد هەوارا

ســـەر وبسك وکەزی تەڤدە ب زێـڕن

هــــەژین دەسـمال ل گۆڤەندێ ب غارا

گۆڤەند گـەڕیا ب دلـخـوەش وتلیلی

بـنـێـــر زانـــە ل ڤـــێ رەقـصێ سوارا

گـەلەك نـەقـشـن خودا چێکر دنێ دە

ب جـانـیـتـی عـومـر بـۆری بـێ کارا

دلـێ گـەش بـی نائـێـتە پیـری پیـری

کـــەســـی زانـــە زانـــی دونیا نـە وارا

مــــە چـــەند سالا ب سەیـرانی بۆراندن

تالـی پـیـر بـووم نـکـار مەشم بێ دارا

حێستر هەرکین ژ وان چاڤی بەلـەك هەر

تـــە لـێ دانـــی ل ســـەر ڤـا ئـاڤا سارا

ل پـــەی گـۆڤەندێ تربا کوور جهێ مە

چ بـێـژم ئـــەز مـــرن چـارەك نـەچارا

ئـــەرێ گـۆشـتـێ نازك ڕزی د توربێ

بـــفـــکـــرە کـا ل هـەسـتـیـیا چ کارا

ئەرێ کـا مـووڤکێ تەلـی وپـیـیـێ مە

وە یـانـــی کـانـی ئـەو لـێـڤـێ جغارا

کــو حـەیـفـا قـۆقـی سەیری مایە ڤالا

جـهـیَ مـیـژی مـشـکـا داوەت ل دارا

گـوه وچاڤـیَ بـەلـەك كا بی چاوا بوون

فــەلــەك بـیَـژم ئـەو بوونە جەعدا مارا

ب ڤــی حـالـی تــەنــیَ مامـە د تربیَ

دتــرســم ئـەی عـەذاب گەلـەك غەدارا

کو نەفسا پیس بوو ئەڤ ئانی سەریَ مە

ب ڕۆژ وشــەڤ ل طووری سەد هەوارا

## ( ٨٣ )

# یا رەب تە کوو ئەز چێکرم

یا رەب تــە کــوو ئەز چــێـکرم　　دانـــیـــنـــە دل داغ وکــەســەر
هــیێ ئــەز بچووك ســێــوی کرم　　نــالــیـن وئــەفـغـان تــێـنــەدەر

چــۆل وچــیــا ئـــەز گـــەڕیــام　　نــاڤــا غـــەریـبـا ئــەز گــهــام
دل شـــەووتـــی ئـــەز حەلیام　　جەرگ بوویە خوین نینە مەفەر

ئــەز عــەبــدەکی تــێــر گــونهم　　وەك دارا هــشــك ئەز بیێ سهم
یــان مــاریێ طــازی بــیێ جــهــم　　حــالــیێ فــەقــیــری دایــە ســەر

نــاڤــا دلــی مـــن هــەڤ طــەوا　　لــیێ وەرگــەڕاند حەرفێن هەوا
ســـەر دانـــیـــنـــە داغ وکــەوا　　حــەرفــێــن تــورابــیێ کرنە دەر

نــاری ومــائـــی لــیێ خــوڕیـــن　　پــیێ ڕاست وچەپ ئەم زیڤڕین
هــاویـــــری دل بـــوویــە بریـن　　بــەس نــوقطەیەك ما سۆر وزەر

زانــم کــو ئـــەز دل قـــەڕێـــژم　　ئـــەز فکرەکی دوور تاڤــێــژم
کـــەس نــابــیـنــم فکریێ بــێــژم　　لــەوما ل مــن دل بــوو چەپەر

( الله ) ژ وی ( قـالــوا بـلی )　　ئەز دانـیـبووم پورِ موبتەلا
زێـدە کــرن کــەرب وبـــەلا　　دانـیـنـە دل تـیـرێن قەچەر

داهــی ببـێـژە هــەی هـەوار　　بـەر ئـێـشا ڤا دەربێ غـەدار
دا کـو بـمـیـنـی تــو شــیـار　　پــورِ زێـدەنـە طەعن وئەڤەر

( ٨٤ )

## ل سەر دكاندارا
## وحالێ مە د ڤێ زەمانی دە

فەلەك بوویە ئێڤارە    چ بێژم ڤی زەمانی
دل خوینە بریندارە    تەنێ ماما ل خانی

هن طازی بوون وەك مار بوون    ئیرۆ ل مە توجار بوون
د نەفسا خوە كوبار بوون    خوە دكن شێرێ زەمانی

من فرۆتی پەزێ خوە    من لێدا بوو رەزێ خوە
من حەلاندی بەزێ خوە    حەتا من دكان دانی

ئەمن ئیرۆ ئەفەندی    چەنطە دەینن سەر زەندی
روونێ مە بوو هوولەندی    گۆرە شوغلێ ئیرانی

بەدل بوونە ترگالی    خوە دهەژینن ب دەلالی
مەلەك كەسرا ل حالی    ڤەخوار چایا سیلانی

پەردە ئانین ژ كوێت    كشاندن پاكیتێ كێنت
ما ئەو كیە بلا بێت    دڤێ قەهوا یابانی

| | |
|---|---|
| قەهوا مومتاز قەهوا رەش | ئەم میرخاسن ئەم روو گەش |
| ڤایە هەیە بیهنا خوەش | تتنا کیسکی کلانی |
| مسکا شوغلی فەرەنسا | کەفی هاتن ژ نەمسا |
| هەرە ژ خوە رە بپرسا | ڤا مەحفووری لبنانی |
| جەزمە ئانین ژ رووسیا | کوم بوو ژ ئەندونسیا |
| شووشە ژ ئوقیانووسیا | لینە گولی ئەلمانی |
| فنجانا قەهوە ژ صینە | شال وحەریر هندینە |
| ئەم ب وا روو سپینە | بنیر شمکا یەونانی |
| تتنا پاقژ ژ نەحیتی | باسیق ژ حلدەحیتی |
| ل سەر ناڤی محیتی | من ژی قەط ئەڤ نزانی |
| هن صووفینە برچینە | دلرەشن سەر سپینە |
| خاپی وایی رووڤینە | خوە دکن قوطبی گەیلانی |
| هن پیرەکن ب تومانن | هنەك روو ب دەرمانن |
| خوە هەتکاندن نەزانن | سەر مەمکا کیسك دانی |
| بروو چاڤ وی قەلەم کر | موو هلکر روو عەدەم کر |
| جان ودل تەڤ ئەلەم کر | ئەڤ بوو حالی زەمانی |

هـــن پـيـســن دل قەريـــژن   مـــل فەرە دووڤ دريـــژن
حـەيـا خـــوە ئەو تاڤـيـــژن   بوون مەيـمـوونـى ئەلبانى

هـــن مـــەلانـــە عــەميلن   هـن حاجينە ب تـەسجيلن
هـنـەەك بـۆ وان شـەغيلن   ئـــەڤـــە فـــەرهادى وانى

ئـــەز روونـشـتـم د مل دە   سـەرى خوە ل من نەهلدە
ڤـأيـــە گـولـــەك د دل دە   مـــە ئـــەو د دل هـــلانـــى

فـەخرا وە بوويە پەرى وە   چ هـاتـــى‌يـــە ســـــەرى وە
فەقـيــر كـارى بـــەرى وە   كـيـلـوەك فستەق وە تانى

ئـــەم دەرويـشن فەقـيــرن   د بـــن دەسـتا ئـيـســيــرن
رووڤـــى ل مە ئـــەمـيــرن   دچــــوونـــــە قـەصرە بانى

ئـەم ب خـوە تـەڤ طازينە   فـەقـيــرن ئـەم بـرچـيـنـە
كەڤچيك روون مال دە نينە   مە دڤن صـۆلـى روومانى

خـــيـــزانـــى‌يـى نـكـارى   بـكـرى روونـى بـولغارى
چـاڤـــى مـن بـوونە تارى   ب پـــەنـــيـــرى ئـەسپانى

ب نـــيـــڤـشكى فرنـجـى   مـــە دڤى تشتەك برنـجـى
نيسك ونۆكى كورمانـجى   ناڤدە بى كەڤـچـيـك دانى

کراسی مه بەرلوونن ئەم قەپالە دهوونن
گراری مه بێ روونن خوەستن گۆشتی کەوانی

عەجیب من دین ب چاڤا پیتی دایە هناڤا
تاری بوو رۆژ چوو ئاڤا فەلەك کانی جوانی

من جانیتی نەمایە پیری ل دەر دەریایە
ریا دونیا وەهایە بووم کالەکی زەمانی

ڤایە چەند موو سپی بوون دنانی تە رزی بوون
هەڤالی تە نڤی بوون تو دخوازی طوورا بانی

خودا ئەز دام دونیایی سەری من کر بەلایی
ئەز مەشغوول بووم ب چایی نینە کوونی زستانی

بەرفی گرتی زنناره سهی دایە نزاره
طووری ل تە ئیڤاره زادی ریا تە کانی

( ٨٥ )

# سەلام ل دۆستا

سـەلامـی مـن ل دۆستی دل حەبانـدی
مە ئەو دۆستە ئەوی مللـەت جڤانـدی
ل سەر یەك ری دگۆتی تەڤ بن یـەك
ب راستی بی نەکو ب حیلا خاپانـدی
ئـەزی بـیـــژم دوسـی ریـزا ژ بـۆ وە
ژ نـاڤـا دل ب وا داغـــی کـەوانـدی
مە گۆ بەغچی مە هەر سیـڤ وهنارن
هـەژیـــر ومشمش وخـۆخی نەقاندی
عنجاص وئالۆ چ ئـەرووك ب وان رە
گـــوهـیـژ وگـولیازی دلا حـەباندی
بـــەهـیـڤ وهوورکی هـرمی دەلالـن
ل سـەر وان رە میوی تـری تەوانـدی
رەز وبـاغـن د نـاڤ کـانـیـی سپـینە
ئەڤـن فیـکی باڤ وکالـی مە چاندی
دە کا بـیـژە بـی ئـەو مانـە ژ کـی را
مـە تـەعب دیت وترکا ژ مە ستاندی
گەلۆ کانـی ( عوبەیدللاهی نەهری )
ژ ناڤ مـلـلـەت نـەیارا ئەو هلاندی
مە گۆ : کا شیخ سەعیدی شیخی پالۆ
دیاربـــەکـری کـو تـرکـا شەنقاندی

ئـــەری رابـــە سەید عـەلـی ژ هیزان

( شهاب الـدین ) پیـرە هاتی رەڤاندی

ئەمـیـر وبەگلـەر وئاغا دکـوشـــتـن

کـــەسـی مـایـی ل دونیایی گەراندی

ئەڤە دلـخـواز ژ بــۆ وە ئەز دبـیـژم

ل سەر ڤـی ری عتاب ل من گەراندی

دبـــیـــژم ئـــەز ژ بـۆ ئـەهلی زەمانی

ڤـــەکـن چاڤا هلـدن سەری تەواندی

نەبـیـژن کـو گـوشتی مالـدارا زەحفا

وی بی رووکی ل وە ژەحرا کەلاندی

ئەڤە چەند ریز ژ بۆ وە طووری گۆتن

گـەلــەك مانـە د سنگی حەووشاندی

## ( ٨٦ )

# راستی بیژن مەلانۆ

گەلی برا دبیژم      راستی بیژن مەلانۆ
ئەز نە لالم نەگیژم      راستی بیژن مەلانۆ

هەر سی هەیڤی زستانی      مەلا دخوینی قورئانی
ژ بۆ داگری هەبانی      راستی بیژن مەلانۆ

هنك روونی حەلاندی      هنك قەلیا کەلاندی
د ناڤ دەنا هلاندی      راستی بیژن مەلانۆ

هەر سی هەیڤی بهاری      مەلا ددی کارکاری
ژ بۆ بدنی گەماری      راستی بیژن مەلانۆ

بسك کەژ ویەك هری      دەستەك نڤین چیکری
کیفا خوە پی خوەش کری      راستی بیژن مەلانۆ

هەر سی هەیڤی هاڤینی      مەلا دخوینی یاسینی
ژ بۆ خەلکی بخاپینی      راستی بیژن مەلانۆ

هنك فطر وهن زەکات      کیفا مەلا پی دهات
حالی مەلی کیفەرات      راستی بیژن مەلانۆ

هەر سی هەیڤی پاییزی      ل دۆر مالە دتییزی
چاڤی مەلا ما ل ڤیزی      راستی بیژن مەلانۆ

چاڤی مەلی ما ل سیوی      دا کو بخوی مالی وی
ئەو ژی خیرا باڤی وی      راستی بیژن مەلانۆ

ئەی مەلایی زەکات خوەر      چاڤی تە مایە ل بیندەر
راستی ژ خوەهری ناکی دەر      راستی بیژن مەلانۆ

بەلی مەلا هەنە باش      بگۆری بم رە وشاش
عومری خوە نابن بەلاش      راستی بیژن مەلانۆ

ذکری خودا ب دل ددن      سەر تفنگی پال ددن
رۆژا قەومی مال ددن      راستی بیژن مەلانۆ

مەلا ئەوە سەر بلند      خەبەرا وی راست ورند
ناڤ جامیرا مووم وفند      راستی بیژن مەلانۆ

گەلەك مەلا مە دینە      کول دنیایە نەدینە
داهی مەعنا هلینە      راستی بیژن مەلانۆ

( ٨٧ )

## ژ صووفی‌یی نەگوهدار ره

بـنـيـرن هـوون گــەلـى دۆسـتـا ل مـەيـدانا غـەم ودەردا
نــەزان زەحــفــن د وەخـتـى مە دبێژن ئەى وە دين بەردا
ژ قـــەهـرى ڤا نەزانە ئەز هەژيـمـە هـــەر كــەتـم عـەردا
تــەصـــەووف عـلـمـەكى خەفيا د باطن دە مە گـۆ گەردا
ب فـەضـلا خـوە خـودا دايە كەسى خوەستى ل سەر عەردا

بـكـن بـاوەر ژ مـن ئـيـرۆ گـەلـى دۆسـت وهـەڤالـى من
طـەبـيـبـى دونـيـا تــەڤ رابـن ناكن دەرمان ل دەردى من
تــەصـــەووف دەرمـانـــى دەردا شـــەفـا تـانى ل دلـى من
سـرر وئـەخـفـا خـەفـا پـيـرا هـــەوار بـەردانە بەحرى من
ب نـەفـسـا ناطقە سەربەست وەكى بەرق وبرووسك رەعدا

ب نـەفـسا موطمەئن ديسا ل وى قەلبى هەر موصەووەر بوو
دەلـيـلا مـــە ( رواه مـسـلـم ) ژ حـەديـثـا پـيـغەمبەر بوو
كــەســى ئـنـكـار بـكـى يـەك جـار د داريـندە ئەبتەر بوو
حـــەچـــى زانـــە دكـــى بـاوەر ژ قـورئانى چ كەنز دەر بوو
مە بورهان ئايەتا فورقان دوا ل ( فەجرى ) دە خوەش سەر دا

بـفـكـرن ئـەی گـەلـی گوهدار ل ڤان خەلقی خودا چیکر
ژ بـۆ طـاعـەت بـكـن دائـم ژ نـەبـیـان ره وەحـی ریـكر
د لــەوحــی ده بـەیـان كـر وی بـەلـی واسطـە بەینی كر
ڤـەشـارتی وی ل پوشت پەردی ل سەر عەردی سەلام لیكر
حـضـوورا قـاصـدی هـەر وەخـت هلانیـن حجاب وپەردا

بـنـیـرن هــوون ل نـاڤـا دل بـی ئـەو مـەنـنـە ویان سەلوا
نــەظــەر كــر مــن ل دیــوانــی ژ بـۆنا خوە نەدی فەتوا
تــو بــگــره سـلـسـلا قـائـم دەما كـو تی ل سەر خەلوا
بـكـە طـاعەت ب رۆژ وشەڤ ب زەحمەت ئەو دبی جەلوا
حـەقـیـقـەت باطـنــی دەرخە بی سەطرنـجـە ویان نـەردا

( فـاقـرأ واعـتـقــد بــهـا ) ب واســطــە كــەسـی زانی
مــە دل فـولـكـا ل سـەر بەحری كو سلسل هاتە مەیدانی
كــو زەورەق تـیـن گــەمـی پیره هلاندن پەردە ژ ئەیوانی
شــەفــەق دایــە وەكـی رۆژی كـەسی دیت تینی ئیمانی
لـغـابـا دل بـشـدیـنـە ســەری هـەسـپـی ژ نــوو بـەردا

بــنــیــرن صـاحــبــی عـەقـلـی بـكـن بـاوەر ژ قەلبانە
مــە خـــوەنــدن كـتـابـی قەنـجە د پوشتی تەعلیمە وانە
گــەلـی دۆسـتـی جـڤـاتــی دە ســەلامی من ل قەنـجانە
بـمـەشـن هوون ب حەقی ئی ل نك حەقی چ خوەش فەردا

( فـلا تـغـتـر ) ب وى عشقى ( ألا يا كاتب ) ى سەطرى
دەمـا روهـنـى دهـاتـى خوار ل سەر دل بوو وەكى بەدرى
طــەواف كـــە تـو زەمانى هات ژ بەعدى رە بكە صەبرى
داهـــى جـانـى تە حەليا بوو ب عشقى لـەو كەتى عەردى
طــەوافــا وان ب مـن چـيـتـر ژ كـافــوور و ژ مـاوەردا

( ٨٨ )

# ب سەرهاتی‌یا من
# میروی ل ناڤا وەرزا

ئـــیـــرۆ عـــەجـیـبـەك من ددی      یـەك مـیـرستان بی چەنگ وپەر
لـەومـا کـــو ئـــەز نـاکـم فدی      مــن ژیـــره گـۆتـی چەند خەبەر

مـن پـــورس دکـــــر ژ مـیـروی      تو ژ کووڤە تی ب کووڤە چوی
دەست وپی‌یی خوە ب چ دشوی      تــە رەش کـرن ئـەو کەزیی زەر

ژ بـــن عـــەردی تـــو دەرکـەڤی      تـــو نـاسـەکـــنـی رۆژ وشـەڤی
خـــەو ژی ب چاڤـی تە ناکـەڤی      دچـــی وتـــی ئـەو بـــی مـەفەر

تـــــو ل ڤـــا دەرا ل چ دگـــــری      تو ژ کووڤە تی ب کووڤە هەری
فـەیــدە چیـە ل ڤـی سـەفەری      ئـەزی تـە ژ ڤـیـدی بـکـمە دەر

مـیـروی جـــەوابـا مــــــن ددا      خـــەبـــەر نـەدە ژ حوکمی خودا
ئـەم فـیـرسن د شوغلی خوە دا      ژ دل بـــەردانـــــە ســـەد کەسەر

ئـــەم مــــیـــرونـــە ئـــەم کاملن      ئـــەم چـاڤ رەشـن تـیـر عاقلن
ژ بــــــۆ تــفــاقـــــی عـــادلن      عــــەسـکـەر ژ کونـجی هاتە دەر

من ژیره گۆتی چاڤ رەشی ‏ ‏ ‏ ‏ ئەی نازکی خەبەر خوەشی
هیدی هیدی هوور دمەشی ‏ ‏ ‏ ‏ بەژنا زراڤ ئانیا کەڤەر

دچی وتی ل بەر تاڤی ‏ ‏ ‏ ‏ تو بی جلی بی پیلاڤی
زیدە نەکە تو وی گاڤی ‏ ‏ ‏ ‏ نینە ل تە ما یەك کەدەر

ل من نیری بوو خوەش کەنی ‏ ‏ ‏ ‏ تو تووتاکی تو رەبەنی
یەکی گۆتی تە ئەز بەنی ‏ ‏ ‏ ‏ مەعنا چیە چ هاتە سەر

ئەم میرونە ب گەر وفەرن ‏ ‏ ‏ ‏ رۆژ وشەڤی ئەم دگەرن
مەلکی مەیە ژی ناقەرن ‏ ‏ ‏ ‏ کوشتنا خوە دەینن ل سەر

میروا ل من گرتی رکە ‏ ‏ ‏ ‏ هوجووم بەردانە قتکە
رزقی مەیە بەس ژی بکە ‏ ‏ ‏ ‏ داهی ژ ناف وەرز کرنە دەر

( ٨٩ )

# بها نينه ب دونيايى

بــهـا نــيـــنـــه ب دونــيــايـــى ل بازارا مـهزاجى دا

وهكـى كـايـــى بـــدن بايـى كانين حهبين عهفارى دا

عـومر بۆرى ب دل ئيشى دبيژم ئهى گهلــى گوهدار

عهمهل نينه ب ڤـى كارى نيزيك وى بچى مهزارى دا

مه گـــۆ سووسن كهنووشينه ل ناڤ بهرفى تهرازوونه

چاوا نيرگز گهش وشهنگ بى د وى گهرما هاڤينى دا

دى چاوا بى ل حالــى مه دهما بـمـرم ب يـهك جارى

هوجوومى بدنه مه رهشـمـار شـهڤـا تارى د تـربى دا

دل وگـورجــك بـــريـــندارن ژ تـرسـا دژمنى تربى

نـزانـن كهس ب حالــى من ژ عشقا گو جهگهر پيدا

ئهزى بگريم ل حالــى خوه ئهڤه سه سال هناڤ سۆتن

د تـربـا تـهنـگ وتـارى دا ئـهوه تـالــى د دونيى دا

دونيا پووچه بهطالـه ئهو چ خوهشى بى چ زهحمهت بى

ل نـك طـوورى بـهـا نـيـنـه چ بـهـشته د دۆژى دا

## ( ٩٠ )
# چ كەسێ علمێ عەصری نەخوونێ وێ بێ ئەهلێ سوئالێ

جارەك دچووم نەوالێ      یەك سەك نیبوو ل پالێ
من پورسی كا ئەو كی بوو      گۆ دلبەرا شەپالێ

من لێ نێڕی هاتە من      كول كەتنە سەر دلێ من
بها كێم فەیدە مەزن      زێڕ وزیڤن ل بالێ

حوب هاتبوو سەر دلە      زولف بەردانە سەر ملە
ئەڤ علم نەی جاهلە      بخوونە تو ب كەمالێ

من خوەندی حەتا كو دیت      ژ ڤر ئەز چوومە هریت
بەژن زراف وەكی چیت      سۆر وزەر كەتنە خالێ

خال سەر ئەنیێ زەلال بوو      شۆخ وشەنگ وشەپال بوو
من خوند حەتا خلاس بوو      بوومە ئەهلێ سوئالێ

بوومە فەقیر بێ حال مام      علمێ عەصری ژێ ڕەڤام
ب سیاسەتێ نەگەهام      وەكی ئەهلێ هەسكا لێ

ژ بۆ تە ئەز هاتمە      بنێرە تو ل حاكمە
خوارن بەحرا ظالمە      هەرن بینن ژ مالێ

ئەگەر تو ناکی باوەر     بنێرە تو ل بیندەر
بەحرا مەلیێ ناکن دەر     حەتا ئەم ببنە مالیێ

صەبرا مەلیێ نەما تێ     بەحرا وی ل ناڤ زەکاتێ
شاپە ب مەلیێ دە هاتێ     وێ دابوویە کال کالیێ

دەما مەلا فککری     خەلقی زەکات ژێ بڕی
سەر حالیێ خوە دگری     ژ دل گەلەك دنالیێ

حەچی مەلائێ جه خوەش     صوبه وئێڤارە ڕوو گەش
وێ بره دایە چایە ڕەش     ناوەرگری شەکالیێ

حەچی مەلائێ پێشی     علم دابوو دەروێشی
بەرێ مە دا ڤی عێشی     رزق سەر پوشتا غەزالیێ

من گۆتی وجدان نینە     حەیفا علمێ شێرینە
ئیرۆ بها وی نینە     خاتر مایە سەر چالیێ

ئەگەر تو ل خەلقی فکری     بخوونە علمێ عەصری
ژ بۆ کەسەك نە غەدری     تو ناکەڤی زەوالیێ

داهی بەسە ئەڤ خەبەر     کولیێ دل تەڤ نەدە دەر
فەهیم مەعنا دکی دەر     بلا نەذیر بنالیێ

( ٩١ )

## ژ دونیائێ ڕە

دونیائێ هەی دونیایێ    سەرێ مە کر بەلایێ
بەلایێ زەحف وزۆرن    هاتن ل مە دونیایێ

دونیایێ ئەز خاپاندم    گەلەك پیسا دونیایێ
دەشت وچیا گەڕاندم    بێهنا خوەش قەط ژێ نایێ

بنێر چقا ئەو پیسا    کەیف ولەعبا ئبلیسا
بۆ غافلا ئەنیسا    صەبرا قەنجا لێ نایێ

حەچی زانی ژ خوە زانی    نەزان چوونە سەیرانی
وەك عەفنکە هەبانی    پیسە قەنجی ژێ نایێ

ڕیا دونیا نەباشە    دائم بەروار وکاشا
پەرتالێ وی قوماشا    کەڤنە بها پێ نایێ

لەذذەتا وی غەراندم    ژ هەڤالا قەتاندم
ڕاست وچەپ زیڤڕاندم    وەکە دینی قلایێ

گەلی دۆستێ جڤاتێ    ژ خوە ڕە بکن خەباتێ
صەبرا من قەت نەما تێ    بەر بدەنە زولفێ نایێ

نەبێ مرن ل دوورە	ڤایە نێزیك ل زوورە
کا بارێ قەبرا کوورە	عومرێ کو بۆری نایێ

ڕۆژ ب ڕۆژێ ئەجەل تێ	ساعەت ساعەت ب خەف تێ
تەبات ژ ترسا هەو تێ	ژ بەر ئەز کەتمە تایێ

بفکرن دۆست وئەحباب	دونیایە چەرخ ودۆلاب
هەنە ژ بۆ وی ئەسباب	چ بکم ل پەی من نایێ

بنێڕن گۆڕستانە	ڤایە ئاخر زەمانە
ڕیا قەنجا وەهانە	باڤێژن وەکی کایێ

کانی برا کانی باڤ	حەمی مرن ناڤ ب ناڤ
وەك تو ژ سیێ هەری تاڤ	پێژنا عەورێ تە نایێ

تە نە عەورە نە بەرقە	ژ لەو دلێ تە قەلقە
ناڤ قەنج وپیسا فەرقە	بنێڕە تو ل سەرایێ

پاییز هات وتە نەچاند	بوو زفستان نوو لەزاند
ئاڤ وحەڕی لەڤ گەڕاند	تۆڤ باڤێژی شین نایێ

چڤا ئاڤێ بنۆشی	بەرخ وکارا بدۆشی
سلك وتڤرا بفرۆشی	نووڤە فەیدە ژێ نایێ

بوومە پوشمانێ ئەوول     پیسی وقەرێژ کەتیە دل
نووڤە قەط ئەو نائێ مل     دار ڕزی پەل پێ نایێ

ژ نوو شڤەك دچاندی     بائی لێدا هەژاندی
وەرسەل وەرسەل حەلاندی     دەما کو تاڤ گەهایێ

بنێرە تو ب عبرەت     بکە طاعەت ب زەحمەت
حەتا جەسەد ببی قەت     کو چوو عەفوا تە نایێ

نیسان هات ورازا بوو     ل هاڤینێ پالدا بوو
ریا شخرا وندا بوو     هێژی تو خەو دە مایێ

پاییز هات وجەمدی     پوشمان بووم من گۆ گدی
ڕیا شوغول قەط نەدی     لاش طازی سەرما دایی

زستان ب سەر دە هاتێ     بەرف وباران وبا تێ
ئەز گەڕیامە ل جڤاتێ     طەعن دە کەسێ گهایێ

مادەم تو وێ دزانێ     ڕابە هەڕە مەیدانێ
بکە کارا زستانێ     هێ جانیتی تە مایێ

عومرێ کو چوو خلاس بوو     ڤایە هەر کەس دەرباس بوو
عەمەلێ وان ل پاس بوو     ڕۆژا ( قالوا بلی ) یێ

گەر تو دخوازی عەجێبێ — بنێرِ تالیا کتێبێ
حەتا ژ دەستێ مەلێ بێ — دل باڤێژی هەوایێ

هەوا ژ دل شێرینە — مەحبووبە هنگڤینە
کەسێ ڕاستی ئەمینە — وەکی غەوثێ غەیدایێ

دونیا سەکنی ل پێشبەر — خەطەك سپی سۆر وزەر
ژ دیوانێ کرم دەر — چما تو ل پەی من نایێ

من دگۆتی گەرا ڤێ — قەنجا پیسا چرا ڤێ
سۆز دایە من تو ناڤێ — هیڤی هەرِم مەئوایێ

یەنابعێن شێرینە — زەلالن ئەو سپینە
مشلێ وا قەط تە نینە — دەرمانن بۆ شەفایێ

ل دونیایێ مێهڤانم — وەکی مرم گاڤانم
هێ ئەز کێمتر ژ وانم — ل نك یێ شووندە مایێ

گەلی برا بنێرِن — مەعنا شعرا هلدێرن
یەك ب یەك حەمی خێرن — مەعنا کوور دل دە مایێ

مەعنا کوور نایێ گۆتن — طەمعێ جامێر صرۆتن
هەستی ژی نایێ نوهتن — بەرێ خوە دان سەرایێ

دز وخـــوەیـــی دبـوون یـەك        حـەچی نـــەزان دگـــۆ پـەك
ئـەمـیٚ بـسـتـیـنـن بـیٚ شەك        مـوحـامـیـان خـاپ دایـــیٚ

ئـــصـــلاح دگۆ سەربـەسـتـن        مـــوحـامـــی دا ڕاوەســـتـــن
حاکم دەفتەر لـەڤ خـسـتـن        پـیٚـــژنـا ئـــەمـریٚ مـە نایـیٚ

بــنـــیٚـــڕە تـــو ل دیـــوانـیٚ        حـــیٚـــل هـاتـــنـــە مـەیـدانیٚ
فـەقـیـر پـــەپـــووك چ زانـیٚ        پـــەڕیٚ خـــوە دان هـەوایـیٚ

داهـــی بـــوو ئـەو دگـۆتـی        ئـاڤـا زەلال دنـــوهـــتـــی
نـــەذیـــر جـەگـەر دسۆتی        بـــیـــنـــن ژ بـــۆ وی چـایـــیٚ

# ب سەرهاتىيا من د خەونىٚ دا

جارەك ژ جارىٚ رەبى — چوومە ديوانا نەبى
د وىٚ وەختىٚ ئەز نەبووم — د لەوحىٚ دە ئەز هەبووم
مە دى هاتى يەك سوار — سەلام دكر بىٚ كوبار
من گۆتى چ سوارە — گۆ قاتلىٚ كوففارە
شەخصەكى عاقلدارە — صاحبىٚ ( ذو الفقار ) ە
ما قەى تو وى ناس ناكىٚ — كولىٚ دلىٚ خوە ڕاكىٚ
ئەز ڕابوومە چوومە دەست — من يا دلىٚ خوە دخوەست
من گۆتى ئەى دەلال — ژ بۆ من نينن هەڤال
ئەز هاتمە رەجائىٚ — لىٚ دل چوويە هەوائىٚ
تو قەبوول كە رەجا من — ئاگر كەتيە دلىٚ من
ژ بۆ من تو خەبەر دا — ئەزىٚ بمرم ژ دەردا
وى گۆتە من يا حەبيب — تو عاقلى تو ئەديب
تو دزانى چاوا بووم — دائم د شير دە ڕابووم
ڕۆژ وشەڤ كار بوو حەربا — جانىٚ خوە من دا دەربا
خودا نصرەت ددا من — هنەك قەنجى بۆ ژ من
تشتەك نايىٚ بىٚ خەبات — ژێرە دڤىٚ كێفەرات
من گۆتى ئەز دخوازم — تشتىٚ كو بوويە لازم
وى گۆتە من بێژە — زانم تە دل قەرێژە
من گۆتى ئەز نزانم — بىٚ كا ئيرۆ چاوانم
حەتا ئسلام ب شوور بوو — دائم وەجە ب نوور بوو

هەرهەر دبێژم فەلەك        كولێ دل بوونە گەلەك
ل من نێری گۆتە من        تشتێ كو هاتی سەر من
یا عەزیزێ لەوەندی        دونیا بوویە ئەفەندی
سەد حەیف وسەد مخابن        یێ وەكە من وندا بن
ژ بۆ تە بێژم جارەك        ڕابە بدە هەوارەك
حەتا تو ساغی بێژە        تو ڕاستییێ ببێژە
هوون وەرن یا موسلمان        تەڤ ببنە پەهلەوان
هوون وەرنە جڤاتێ        ژ خوە ڕە بكن خەباتێ
هێڤی خودا بدێ وە        ئەو تشتا كو د دلێ وە
نەبێژن ئەو وندا بوو        بەلكی بائێ وە ڕابوو
ئەگەر هوون كو نەبینن        زارۆكێ وە ببینن
هوون هەڕنە جهادێ        دا هوون بگەهن موورادێ
ڤا حەدیشا پێغەمبەر        ژ مە ڕە هاتی ب دەفتەر
جیهادا ڕاستی حەق بوو        ب تەكبیر وبەیرەق بوو
هەر وهەر جهاد هەیە        خوصووصی ژ بۆ مەیە
ل دونیأیێ جامێر بن        ل ئاخرەتێ ب خێر بن
ناڤێ خوە دەینن شەهید        وە یانێ ببنە عەگید
تشتێ حەقێ هەر ئەڤن        ژ ڕاستییێ نەڕەڤن
ب سەرهاتی خلاس بوو        ڤایە هەر كەس دەرباس بوو
د سالا پێنجی وهەشتا        هەزار ونە سەد گەشتا
ب سەرهاتی تەمام بوو        ل تالییێ سەلام بوو
سەلام ل سەر وە برا        چقا كەسێ حازرە
ژ بۆ من دوعا بكن        تەسلیمی نەذیر بكن
نصرەت بدە ئیلاهی        هەر وهەر ژ بۆ داهی

( ٩٣ )

## ل سەر حالێ من وگوهدارە

ئـــيـــرۆ دبـــێـــژم    بـــوويـــە هـــەوارا
نـــە كـو ئەز گـێـژم    ڤـــايـــــە ديـــارا

هـــوون هـەرنە دژمن    هـــێ نـەبـووی مەزن
كـەچـك كو بوو ژن    ئـــەو پـارسـوو خوارا

دكـــی پـــێـكـــۆلـــێ    وێ بـــەر ل چـــۆلـــێ
دســتـيـنـــی هـۆلـێ    دبـــــێ ديـــــــارا

حـــەتـا ب مـال بووم    ب دۆست وخال بووم
دەمـا فـەقـيـر بـــووم    گـەلـەك بێ حال بووم
ب دەڤ دبـــێـــژم    ب دل نـوو كال بووم
ســـهـــێ دگـــرتـی    ل ســــــەر نـــزارا

حـــەتا ئـەز جان بووم    وە ئـــەز دڤـــێ بـــووم
وەختێ ئەز پـيـر بووم    ئـــەز بـێ خوەيی بووم
ل بـــەر ڤـــا ئـــاڤـــا    نـــوكـــە جـــڤی بووم
بـــەرفـــێ دگـرتـی    ل ســــــەر زنـــارا

حەتا قەلەو بووم　　وە ئەز دمێهتم
ئەز بوومە هەستی　　وە ئەز ئاڤێتم
لێ دیسا ئیرۆ　　ئاگر وپێتم
تەڤدە مە جەنگە　　ل سەر نەیارا

دارا من شینە　　من پێ نەزانی
ل من هاڤینە　　نەچووم دیلانی
غەم تەڤ جەڤینە　　خورتانی کانی
روهنی تو نینە　　ڤایە ئێڤارا

خورتانی چووبوو　　پیری گها من
پاییز هێ زوو بوو　　نینە بها من
دل پێت ودوو بوو　　بۆنا مها من
ما تەخت ل کوو بوو　　هۆستا نەجارا

بهارا رەیحان　　ئیرۆ خەملن
سووسنێ ئەیوان　　ناڤدە عەدلن
نێرگزێ کەسران　　دۆرێ فتلن
ئالایا خۆرتان　　دانین سەر دارا

ل من هاڤین بوو　　بولبول دنالی
دل تەڤ برین بوو　　نەچووم ل ئالی
گولا من شین بوو　　من دا ڤیا لی
عاقل کو دین بوو　　ما بریندارا

بایێ شمال ڤا		چرا من تەفاند
ئەجەل ب خەف ڤا		گولا من وەشاند
دووربینا چاڤا		پاییزێ ڕەڤاند
کانوون ب ڕەخ ڤا		بینی دو دارا

داربەستەك ئانین		لاشێم دشتن
جڤات ددانین		حیستر مالشتن
جلێ من ئانین		ژ خوونێ ششتن
کەفەن دەرانین		ل پەی هەوارا

ڕابووم خەبەر دا		من ژی نڤیسی
عومر ب دەر دا		شەیخێ بەدلیسی
کەسەر د بەر دا		ئالا تەییسی
نالین چوو عەردا		نالین غەدارا

نالین غەدار بوو		ڤایە خویا کر
یەك ژی سەردار بوو		زەندەك ل با کر
داهی گوهدار بوو		ژ خەو شیار کر
خەونا ڕەشمار بوو		زانم نەیارا

( ٩٤ )

# ل سەر دووربوونا برا

دبێژم بۆ تە گوهداری      بنێرە تو ل ڤێ طاقێ
فەلەك كو كریە نەیاری      بلا چاڤ حێسترا باڤێ
ل من رۆنی دبوو تاری      دەما چوو ئەو گولا ناڤێ

فەلەك چەرخا خوە هەژاندی      ل ناڤا بورجێ ئەسمانە
ل سەر هەفت برا گەڕاندی      ژ هەر حەفتا د دوومانە
دل ومێلاك هەڕشاندی      كو ناڤا دل بوو پێتخانە

مە ناڤ دل غەنجە ونازی      ب وێ قەهرێ ب وێ زەجرێ
ب ڕۆژ وشەڤ ب ئاوازی      دەما گول چوو ئەوێ قەبرێ
كو وندا بوو ل من بازی      ب زارزارە حەتا فەجرێ

ب زارزاری تو هشیار بە      وەها نێزیك تو مێهڤانی
لێ دونیا چەرخ ودۆلابە      ئەمر بێت ئەو ژ ئەسمانی
ژ مرنێ ڕە تو خوەش كار بە      ئەجەل ها بێ ل ڤی خانی

ل ڤی خانی ب قەهر وكین      مە نێڕی بوو ل مەیدانێ
ژ ڤێ قەهرێ ئزم غەمگین      كو بولبول چوو ژ دیوانێ
وەزیر وشاه صفەت ڕەنگین      ئە نابینم ل سەیرانێ

کـــو ســەیـرانا مە شیّرین بوو		ل مـــن هات وەخـتـیّ هاڤـیـنـیّ
چ خـــەطـایـا مـەم وزین بوو		بـــەلـــــەك چـــاڤـا تو نابـیـنـیّ
دلـــیّ گەش شین وشاهین بوو		بـــفـــکـــرە تـــو ل طـاسـیـنـیّ

طـــووری بـەسکە ژ ڤیّ حبریّ		ئـەگـەر مـیّـلاك تـە هـن مایە
ل پـــەی ویّ تـو هەڕی قەبریّ		بـــبـــــت غـــــەرق ل پـیّـلایە
بـــکـــیّـشـە قووەت وصەبریّ		حـــسـابـا پـــورِ ل ور مـایـــە

( ٩٥ )

# ئیرۆ دبێژم

ئــــیـــرۆ دبــێــژم دل وێ ڕانــابـــێ    چاخا ئەز بـمـرم حالـێ چاوا بـێ
لاشــــێ ڕزی بـــێ ل بـەر پـیـابـێ    حەتا وی وەختی ب دەردێ برابێ

ڕابـە ل سەر خوە تو ژێ خەبەر دا    ئـنـسـانـێ زانـــە تـە ڕابوو بەردا
ئـێـشـا دلۆ بوو لەوەند ب دەردا    دلـێ تـە کول بوو داغا ل سەر دا

چـــڤـا ئەز بـێـژم تـو باوەر ناکێ    دلـێ تـە جـانـە کـەیـفـێ دڕاکێ
دلـێ مـــن پـــێـڕە زنـــدا ل باکێ    ژانـا ڤـا بـــرا قـــەط ژ بـیـر ناکێ

دلـێ وە ڕۆژە دلـێ من شەڤ بوو    بەری چەند سالا خەفا وە ئەڤ بوو
تشتا وە گۆتی حەمی ب دەڤ بوو    فـــراقـا بـــیـــنـا من و وە ئەڤ بوو

فــکــرا وە نـیـنـە نـاکـن مطالـە    طـووری بـەسـە لۆ دلـێ تە کالـە
ل ســەر ڤـا بـــرا ببـە عـەبـدالـە    داغـێـن ل سـەر دل بوونە کـۆپالـە

# ( ٩٦ )

# ل سەر شینا

# شێخ ( محي الدين ) ێ شێخ ( ظاهر ) ی

ئاه ژ بەر فراقا تە ئـەز پـورٍ دنالـم ( مـحـي الـدين )
چ بـکـم ئـیـرۆ د دونیا جـەگـەرێ من بوونە خوین
دووری‌یا تـە پـــورٍ جـەفـایـە چوون ژ دل نال وئەنین
ئـەی فـەلـەك دیسا دنالـم دێ ژ بەر نوو غەم جڤین
گەر ژ نووڤە ئەز ئەمر کم غەلغەل دێ بێ سەر زەمین

فــراقـا تـــە هـەر جەفایا پـێ حەسـی‌یا بوون مەلـەك
ئـەز دبـێـژم ئـەی بـــرا سەد حەیفا وان چاڤێ بەلـەك
ما هـــەیـــە کـو ئـەز ببـیـنـم برهێ وان ببنە خەلـەك
دل ومـێـلاك وجەگەر بـوون تـم حەلی‌یا بوون فەلـەك
یا ئـیـلاهـــی تـو بـدە مەقصوودا وی عەبدێ حەزین

حـوبب وعشقا تە د دل دە قەط تو جار ناچت ژ بیـر
ئەهلێ دونیایێ سەراسەر تەڤ ژ بەر بـوونە ئـەسـیـر
سەد هەوار وسەد مەدەد بوون شاه وسولطان وئەمیـر
هـیـڤـی‌یا مـــە رٍەبـبـێ بانی ( إنـە هـو الـخـبـیـر )
کـو ب بـال ڤـــە نـوو گهینی عوود ووەرد ویاسەمین

حەتا بیت معادی رۆژی وەك ل سەر مووسا کەلیم
غوربەتا یووسف د مصری هەم د عەذابی ئەلیم
یان عەذابی جەرجیسی بوو پوشت رە ئەو چوویە نەعیم
کەت دل ومیلاك وهەستی من گۆ ناری ئبراهیم
نەمروودی شیورە خوە دانی ( وقع في الكذابين )

بەیرەق وئالا دلەرزین بۆ فراقا تە برا
ئاتەشی مووسا ل دل دا دل وجان وی هوور کرا
ئەز نزانم لوکس وفانووسن وە یان بوویە چرا
فنجانا نوورها مونەززەه دائما بی هش کرا
وی ژ نووڤە دایە گازی ( هذا لي وحي مبين )

هوون بنیرن کو د دونیا تەڤ حەمی کەتنە عەذاب
بی نەصیبم پور بی چارم لەومە ئەز مامە ل باب
داهی مە پور دەلالە قەولی وی هەر بوو صەواب
ئەی نەذیر بەس کە ژ ڤا بەحثا تە دل بوویە کەباب
( الله الله ) ئەڤ چ کول بوون کو د دونیا مە ددین

١٩٥٢ / ٢ / ٧

( ٩٧ )

# ل سەر شینا

## شیخ ( حسین ) ی شیخ ( ظاهر ) ی

بـەیـــرەق وئالا دهـاتـــن ئـــەی فـــەلـــەك ئـــەم لـەرزیـن
نـالـە نـال وحـــوزن وشـــیـــنـــن دل دبـــوویـە دەم وخویـن
ئـــەمـــری ئـــیـــلاهـــی دهـاتـــی كـو برین پـی تا خـڤـیـن
فـــەخـــرا سـاداتـــی ل طـــووری ئەم نەما قـەط وی ببـیـن
چـــوویـە رەحـمـەت باڤـی ظـاهـر شـیـخ حـوسەینی دلبـرین

بـــولـــبـولـی هــەیـڤـا هـاڤـیـنـی وی ل مـــن خـوەندی دهات
ئەو ژ نك وی هەر ب ری كەت دەشت وچـۆل وكەت فەلات
وی خـەبـــەر دایـــە د گـــەل مـە حـالـی مـە بوو كـیـفەرات
شـیـخ حـوسـەیـن گـەلكی دەلال بوو صەبرا مە پور پی دهات
هـــەی هـــــەوار وگـازیـیـا مـــن نـالـە نـال وحـوزن وشـیـن

ئـــەو وەفـا بـــوو روهـــنـــیـیـا مـن هـەی هـەوار باڤی رەشاد
ئـــــەز دبـــیـــژم دلـــبـــریـــنـــم تـــیـــن ژ دل ئـاواز وداد
ئـــەز د نـاڤ خـــوونـی وەرتـانـیم ژی كرن سەر ژی جەلاد
ئـــەز نـــەمـــا كـــو وی ببـیـنـم حـەتـا بیت ( یوم التناد )
وی بـــرن ســـــرر وكـــەرامـــەت فـرمـانـا شاهی ئـەمـیـن

چاڤ وبورهی ته موناسب قەط تو جار ناکم ژ بـیـر
نەقل وهەجرا وی گرانن حەیفا وی وەجهی مـونـیـر
ئەو چرایی سەییدا بوو پوشتی وی بـــوومە ئـەسـیـر
ئـــەی فـەلـەك کـیـن وخاییـنە وا حەلاندی دل نەذیر
دی چ بـیــژم هـەی هەوارە تین ژ دل تم ئاڤ وخوین

باڤی ئەحـمەد ئەو هیژا بوو حەیفا وی ما ل غوربەتی
جـەگـەر ودل تـەڤ بـوروشتن لـەو دبیژم قصەتی
نال وئـیـش وخـــەم گـرانن ئەو ژ بەر دەریی مە تی
ئـــەم دکـن هـیـڤـی ژ تە یا رەب ببی وی جەننەتی
داهـــیـــی دلـکـول دبـیـژی دل ومیلاك هەرشین

( ٩٨ )

## ل سەر شینا شیخ ( بدر الدین ) وبرایین وی

سالا هـــەزار نـــه ســـەد دیار بـــوو — شـیـســـت وشـەشـا هـەشـتـی ئادارا
مـن گـــۆ فـەلـەك خایـیـن نەیار بـوو — جـارا ســسـىیـه مـــه شـیـن ل دارا

ئـــەی بـــولـــبـــولـــی هـەیـڤـا بهاری — رابـــه هـــــەره بـــده هـــــەواری
نـــی ( بدر الدین ) چـوویـه مەزاری — پـیـتـا هـــنـاڤـــی مـــن غـــــەدارا

دۆســـت وبـــرا تـــو بـجـــڤـــیـــــنـــه — دەنـگـی خوه هلده تو ژی بـخـوینه
دەســـتـــی خـــوه ل باكـه بـتـەوینـه — دا دل بــــبـــــت بــــەرقـا بـــهـــارا

خـــــۆرتــــی دەلال وجـــان ونـــازك — ئـــەو بـــوو ژ بـــۆ مه پوشت وبازك
حـــیـــســـتـــر ل چـاڤـا بـوونه ئاشك — ئـــەمـــری خـــودا هـاتـی بی چارا

ئـەی بـولـبـولـی نـه خوەش دنالـی — خـــۆرتـــی عـەزیـز وپـور دەلالـی
ئـــەو چـــوون مـــەزاری دل دكالـی — كـو ( محی الدین ) چوو دل بوو سارا

مـــن گـــۆ دلـی مـه نـوكـه باگرت — كو شیخ حوسەین چوو دل بوو تاگرت
جـەگـــەر بـــراشت كولا دوتا گرت — هـــــەر هـــەر ب نـــال ودەرد وژارا

ژار ورەبـــەن ونــــەبـــه هار ودیـن — تـــو بـیـــــژه كـا بـرا ( بدر الدین )
غـــەریب چوویه مەزاری دلـخـویـن — نـائـــی ل مـــــن صـــەبـــر وقەرار

من گۆ ل من چوونه وندا بوون     خۆرتی دەلال هەر سی برا بوون
کاهنی ل سەر دلا زوا بوون     هەی هەی فەلەك چقا نەیارا

ئەی ئەی فەلەك بەختی تە کینە     دائم ژ دل تی ئاف وخوینە
یەك یەك برین ل سەر برینە     دەردی ( بدر الدین ) برینە چارا

دەردی برا گەلەك گرانە     نالین ژ بەر چوو ئاسمانە
چەرخا فەلەکی ڤایە عەیانە     پیتا ژ دل فری دژوارا

دەورانە دنی ل من دوتا بوو     خۆرتی جوان ل من وندا بوو
د ناڤ برا پچووکی وا بوو     لەوما کولا وی پور غەدارا

لەوما ل من نەکن جڤاتی     حیستر ژ چاڤا بەرف وباتی
بینن ژ بۆنا من داوەتی     چەند ریزا دەینم بەر نزارا

دەست باڤیم قەلەم وحەبری     بنڤیسم ل سەر کیلا قەبری
دل بوو حەلیا میلاك د عەدری     بەرفی دگرتی سەر زنارا

کولی ل دل دبوونە کانی     ئەی ئەی برا تو زارۆکی جوانی
بگرین ل سەر باڤی جهانی     طالع ل مە فەلەك کو عارا

شەوتا هناڤا هات بهاری     نالین ددا هەشتی ئاداری
رەحما خودا ل سەر بباری     تابووتی چیکن ل نك نەجارا

برا بەشیر وەرە بلەزینە
دەنگی خوە ل قورئانی هلینە
خاتر دخوەستی بەردرەددینە
ئیشارەت ددا گو فا طەیارا

ئاور ژ هەردو چاڤا خوارکر
دەستی خوە ل من هلدا ل باکر
زانم کو وی ژ نك مە بارکر
بگرین ژ بۆ بچووکی برا را

حیستر دهاتن خوار ژ چاڤا
ئاگر ژ نوو ددا هناڤا
دونیا تاری بوو رۆژ چوو ئاڤا
سەلام ددا وەقتی ئیڤارا

ئیڤار تاری نەما ببینم
چەند یاسینە ل سەر دخوینم
داغین د دل دا پی بکەوینم
نیزیك هەری ببت شیارا

دەردی منە ئیرۆ گرانە
دل بوو گەمی ل سەر غەمانە
بیژە برا زیندان چەوانە
زیندان تاری ل من نەیارا

زیندان وفەلەك هەردو نەیارن
لەوما ل سەر دلا دبارن
کول وغەمی زیدە هەزارن
ئەز کو دمام ژ دەرد وبەلا را

دەردی گران دهاتی سەر دل
باری کەتی ل سەر مل
ژ بەر کولا دبوومە سیفل
دارا غەما شینی ل دارا

دکن هیڤی ژ تە ئیلاهی
رەحمەت بدە ل رووحی باهی
عەفوو بکە برایی داهی
داهییی بنال ودەرد وژارا

## ( ٩٩ )

# یەکە دی ل سەر برایی ( بدر الدین )

ئـــەی فـەلـەك دیـسـا تو هاتی پور ب كین وپور غەدار
تە ل سەر جانی مە دانی پـــەنـجـە دل دە بـــرنـــە خوار
هـودهـودی قاصد ب ری کەت وی ل دۆستا کر هەوار
هـــوون وەرن تـــەڤـــدە بلەزینن نووڤە بوویە یەك مەزار
چوویە رەحـمەت باڤی مەعصووم خۆرتی جان وپور شیار

( بـــدر الـــدیـــن ) ئـیـرۆ وەفا بـوو دل ژ قەهرا نانڤی
هـــەر بـنـالـیـن و ب کـالـی بـاطـنـی دا گـوڤـگوڤی
جان ودل تـــەڤـــدە حـەلـیـیان خـەو نینە رۆژ وشەڤـی
دەردی ( بـــدر الـدیـن ) غـەدارە کو برین نوو تاخڤی
دەرد وغـەم یـەك یـەك دبارن صـەبـــرا مە بوویە مەزار

من نەما صەبر وقووەت خیر وخوەشی بوون کـیـفەرات
دل دبـــوو کاهـنـییا برینە خوون وئاڤ هەر ژی دهات
سەر کولا باڤی بـرووسك بوو ئەو ل من بوو عەرەصات
قـــەهـر وعـەجـز وپـور مطالە یەك ل پەی یەکی دهات
بـــولـــبـــول وهـــودهـود ب هەڤرە دانە گازی وهەوار

ئـــەمـــری ئـیـلاهـــی دهات ســەر ســەر وچاڤی مە تی
ئـــەم ب فـــەرمـانـــی رازیـــنـــە چـەند ژ دل نالینە تی
ئەم دکن هـیـڤـــی ژ تـــە یا رەب ببـی وی جەنـنـەتی
سـەلـسـەبـیـــل وکەوثەرن ئەو دی مورادا وەصلەتی
دەردی وی ناچـــت ژ بـــیـر ( ما دامت الفلك دوار )

دەم ودەورانـــە دنـــی ئـــیـــرۆ ل مـــن بـــوونـە ئەلـەم
ئـــەز نــــەمـا قـــەط وی ببینم چەند ریزا بنڤیس قەلـەم
تـەلـلـیـیـی مـــن نـاگـــرن چمکی ل سەر هاتی سەقەم
حـیـسـتـرن خوەش خوەش دبارن ئەو ل چاڤا بوونە چەم
بـــەس ببـیـژە داهـیـیـی مـــن دلـی تە هەر کول وژار

( ١٠٠ )

## یەكە دی ل سەر برا

دەمــی چـــەرخ وبـــەلا هــاتــن ل دۆری غەمی زیدە
كەزەب خــوونـــم ل بـەژن وقامــەتی شیرین ژ ڤر پیدە
دكـم نالیـن وزاری ئەز كو ئەو چوونە د عـەجزی دە
فــراقـا ڤـا بــــرا مــــن دی دبـیـژم وی د غەربی دە
دبـــیـــم حـەیـفا هەزار جاری ل وی بەژنا د توربی دە

مــە گـــۆ بـەژنـا زراڤ ونـازك ورنـــدە كو چوو ئاڤا
دنالـم ئـەز دكالــم ئـــەز ئەری سەر وان بەلـەك چاڤا
كـــو وندا بوون ل من ئـیـرۆ ژ لـەو پـیـت كەتیە هناڤا
چ پـیـتـن ئـــەو ب دژواری دچـن وتـیـن ل ناڤ داڤا
( ســــلام الله ) ل رووحــــی تـە بـرا ئیرۆ د قەبری دە

ئـــەری دیـسـا ئـەزی بـگـریم ل بەژن وقامەتی شیرین
ب نال نال و ب دل ئیشی شەڤ ورۆژی ئـەزم غەمگین
خـــویا ناكـــی ل مە ئیـرۆ ئایین ورەنگی ( بدر الـدین )
جـــەگـــەر چـــوویە كو دل نینە ژ ناڤا دل ئەمی بگرین
ئـــەمـی بگرین ل سەر بەژنی د رۆژ وهەیڤی سالـی دە

خودایی من ته فرمان کر کو وندا بوون ل من هەر سی
نالیـن چـوویـه ب دژواری ژ ڤر تا کو هەری قودسی
دبـیـژم ئـــەز د قـەیـدی مه وه یانی ئەز کەتم حەبسی
نـەبـیـژن تـم دنـالـی تـو ژ دەردی من نەکن پورسی
دلـی من کـەتـیه پەروازە د قەهر وهەم د عەجزی دە

ئـــەری داهـــی تـــە کـول دیتن ب دژواری ل دونیایی
برایی ته هەمی خـۆرت بوون ژ بەر وان ته صەبر نایی
تـــو دەرمـانـــی ڤـا تـەخـتۆره ل دەردی وا شەڤا نایی
دکـــن هـیـڤـی ژ تـــە یا رەب بـەری وا بدی مەئوایی
عەفوو که تو ب رەحما خوه د وی قەبر و د رەوضـــی دا

( ١٠١ )

## ل سەر شینا شیخ بەشیری

ئەی حەبیـبـی مـن دەلال بوو شاه وسولطان وئەمـیـر
ئــەو ژ بــەر چاڤا وندا بوو ئەز ل دونیا بووم ئەسـیـر
نال وگــەرمــیــنـی ل دل دا قەط تو جار ناچی ژ بیـر
کـانــییـا دەرد وبــریــنـا بــەیــرەقا شعرا شەهـیـر
چوویە رەحمەت باڤی فەرهاد روهنییا من شیخ بەشـیـر

روهــنــکــی چـاڤـا دبـارن هــەر وەکـی ئاڤا چـەما
بـیـست ونەه سال وی تەمام بوون ئەو د عشقی دا دما
پـــی دزانــم دەرد وئـیـشـا لەو دکـیـشـم ڤـا غـەما
دووری‌یا وی پــور جــەفـایـا وی ل دل دا ئــەلــەمـا
ئــەو ل رووحی تە بباری سەد هەزار رەحمەت بەصیـر

ئــەز دنـالـم ئــەز دکالـم نابـیـنـم یـەك جار فەلـەك
چاڤ وبــورهــی تـە موناسب کو ل سەر ببنە خەلـەك
بایــی شـەمـال وەرگــەریـنـی عەنبەر ومسکی بەلـەك
هــەی هــەوار وگـازی‌یـا من شاه وسولطان ومەلـەك
ئــەو ژ ناڤ لـیـڤـا دبارین وەك خەطـی بەدرا مونیـر

بــەيــرەق وئالا خــويا بــوون ئــەز دزانــم قــصــەتی
لــی چ بــیــژم ئـــەز نــکــارم راگــرم ڤی زەحــمەتی
باڤی هاشم ئەو هیژا بوو حەیفا وی چــوو رەحــمــەتی
نال ونالن ئاه گـــرانـــن ئـــەو ژ بـــەر دەریــی مە تی
ئـــەم دنــالــن ئـــەم رازینە ئــەمــر وفرمانا خــەبــیــر

دەم ودەورانــە ل دونــیــایــە ئــەو ل مــن بــوونــە نــەیار
ئەی فەلــەك تە خوەش رەڤاندن ئەو کەسی زانــە وشیار
ما چ ســووچــەك مــن هەبوو پەنجە د دل دا برنە خوار
جـــەرگ ومـــیـــلاك تــە زوا کــر ناڤا دل ئاگــر ڤشار
حـــەیـــفـــا وی ئنسانی زانە کانــیـیا مسك وعــەبــیــر

قامەت وبەژنی زراڤ چوون چوونە گۆری ئەی هەڤال
ئـــەز نـــەمــا قـــەط کـــو بــبــیــنــم کانیـیا ئاڤا زەلال
رۆژ وشـــەڤ ئــەز دی ببیژم ئەز ب جانی بوومە خال
چوو ژ دەستی مە ب دۆر کەت سووسنا بایی شــەمال
داهــیـیـی بی رەنگ هەژینی بەیرەڤا حــوزنا بـــەشــیــر

( ١٠٢ )

## یەکە دی ل سەر برایی شیخ بەشیر

دونـیا ل من گەش تەڤ بوویە تاری فـەلـەك دزانـــم تـــو هـەر نەیاری
چـادر ڤـــەدایـــە تـــە ل ڤی واری بـــرا دبـیـژم رەحـــمـــەت بباری
ل ڤـی واری نوو سەد هەزار جاری

بـــرا تـــو رابـە دەستی خوە هلدا شـــەمـالا مـن چـوو ل پی چو فندا
ل ڤـــی واری نـــوو ئـەز بیمە مل دا ب مـــن وی چاڤـی هنگی گۆڤەندا
دل تـی پـەروازە هەر هەر ب زاری

فـەلـەك خاییـن بـوو نەهشت ببینم چاوا ئەز رابـم چـەرخـی هەژینم
ئایاتـی قـورئان ل سـەر بـخـویـنـم دلـی تـە عاشـق ئەز پـی کەوینم
قـووەت مـن نینە غەیری ڤی کاری

رابـــە ل ســـەر خـوە ژ دل تـەوینە ئـەو تەڤ برا چوون حەمی مرینە
دۆرا مـن هات وجەرگی من خوینە دەردی مـن زۆرە هـنـاڤ کەلـینە
ژ بـــەر وی تـربا پور تەنگ وتاری

ل تە پیرۆز بی سەد جاری ئەڤ وار ما قەی ئەز چ بکم فەلـەك بوو نەیار
هـاویـــر دنـیـرم نابـیـنـم یەك جار رابـن ژ گـۆری ئـەو خۆرتی هشیار
بـەری وا چوونە ب سەد هـەزاری

داهـی تـو بەس کە تو بەس ببـیـژە دەورانـــە دونـیـا گـــەلـەك دریـژە
عـشـقـا ڤـی دونـیـا ژ دل باڤـیـژە پـووچ وبـەطـالـە ئەو تەڤ قەریـژە
بـــبـــە گـوهـداری ڤـی تربا تاری

( ١٠٣ )

## ل سەر وەفاتا شێخ ئیبراهیم حەقی

ئـەی گــەلـی دۆستا بنێرِن غەم د دل دا پورِ جـڤـیـن
جــەرگ ودل تـێـكـدا بـرشـتـن ئاخـڤـینا نوو برین
ئەمر وفرمانا خودا بوو هات ژ جــــەم شاهێ ئـەمـیـن
ئـــەز نـــەمـا قـەط كـو بـبـیـنم خال ودێمێ ئەنوەرین
چـوویە رەحمەت باڤێ عەدنان ئەم ب نال وحوزن وشین

شـێـخێ من قوطبەك مەزن بوو هەیڤا راسەر كەوكەبان
نــەقــل وچـــوونـا وی گــرانــن بەرقا ئاگر دا دلان
نال وگـازی پــورِ دچـــوونـە چەرخ وبورجێ ئاسـمان
حــەقــی حـــەقـــی د دل دا پـچـت دل دیسا قەران
ئاه وئاهێ من هەزارن حـەیفا وی قـوطـبـــێ شـیـریـن

ئــەی بــرا ما ئـــەز چ بـێـژم رِۆژ مەیل تێ ژ قبلـەتێ
صـــەوتــا بــولـبـول بـوو ژ بـاطن برمە ناڤا غوربەتێ
ئــەز دكـم نـالـیـن وزاری گریـێ مە ل حالـێ مە تێ
گـەر چـڤـا وەصــفـا بـبـێـژم ئەز نزانـم قـیـمـەتـێ
پوشتی وی مـحـەمـەد زەكـیـە بەغچەیا رەیحان هشین

دۆستــێ دل صافـی ببـێـژن تەڤ وەرن بێژین هەوار
بـەیــرەقـا دیـنـێ مـونـەووەر نوور ل ئەنییێ بوو ستار
ڕۆژ وشەڤ ساعەت ب ساعەت ئێشا دل بوویە غەدار
ئــەی فــەلـەك مـن گـۆ چ چێبوو تە ل مە کریە نەیار
چـــەرخ ودۆلابا تـە دونـیـا دانە مە دل ئێش وکـیـن

چـــەرخ ودۆلابا ڤــێ دونیا من دگـۆ خوەهر وبەلـەك
کانی ئەو وەجهێ موناسب ئەو فەصاحەت هەی فەلـەك
چاڤ وبـورهـێ تە مونەووەر راسەری وا بوون خەلـەك
قامــەت وبـــەژنــێ جارەك تــە ڕەڤاندن پورِ گەلـەك
حوور وولـدان وپەری بوون ئەو ب نوورهێ سەیـیـرین

غەوث وجوود وفەضل وئحسان هەیبەتا وی هەر هەبوو
گــەر چـڤـا وەصـــفـا ببـێـژم ئەو ژ وەصفا زێدە بوو
ئــەو شـڤـانێ دیـنـێ مللـەت مـن دگۆ صەبرا مە بوو
ئاگـرێ ( خلیل الله ) دل نــوورا یــەزدان شەهدە بوو
قــوطــبــێ ئەقطابێ د دونیا وێ شەڤێ دۆرێ جڤـیـن

باڤــێ عــەلـــوان ئەو هێژا بوو پوشتی وی شینێ بکم
ئــەز دخـــوم سووندێ ب یەزدان ئەز نەما کینێ بکم
پـــوشـــتـــی وی عـلــمێ موبارەك چاوا تەدوینێ بکم
حوبـب وعـشـقـا تــە د دل دە ئەز ب وی ژینێ بکم
چوویە ڕەحمەت مورشدێ مە حەیفا وێ نوورا موبـیـن

داهـــیـیٚ رِیٚ دوور غـەریـبە نینە بۆ وی قەط مەجال
( أحـســن الله وتبارك ) كـــو بــــری نــــوورا كەمال
شــــەرع ونــــەحوو وعەقائد هەم ئوصوول مانە ل بال
حكمەت وتـەفـسـیـر وئەی سوبحان ژ شاهیٚ لا یزال

كو مـەلائـك صـەف ب صەف ئیرۆ ل دۆریٚ زیڤرِین

( ١٠٤ )

# ژ شێخ عززەدین ڕە

ئەز دبێـژم شـێـخ عـززەدین ئافەری سەد ئافەری
تـو بـفـکرە هەر ل دونیا کەس نەما ڕەنگێ بەری
قـەصـر وئـەیوانا بلند کە دا کو کەسرا بێ سەری
هـەڕ مـەدیـنـە تو بپورسە کا قەصرا پێغەمبەری
دا وەکـو ئـەڤ هەر د دل بی تاجا وی مینی سەری

خـاکـە دونیا ئـەو دباکێ خاکە پووچ وپوڕ بەطال
عـومـرێ ئنسانی فەنا چوو ئەو کەسێ پێڕە هەڤال
( جـنـة الـمـأوى ) دبـێـژی ڤا ڕیا خـەمـرا حـەلال
بـبـنە گوهدارێ ل ڤێ ڕێ ئەی گەلـی دۆستێ دەلال
دا نەچـت ئەڤ هەر ژ دەست وە بەسەکین وبەربەری

ئەڤ چ کینە ئەڤ چ عەکسە وا د دل دە کـو هەژاند
عـشـقـا ئـیـلاهـیـیـە باقی دێ ژ ناڤا دل هلاند
ناڤ ودەنـگـێ خـوە هـلانـی هاویری دونیا گەڕاند
مـەشـرەب وکاسا زوجاجی وێ ل سەر ما صاحەباند
دێ چ بت حالـێ مە هەر دەم من گۆ ڕۆژا مەحشەری

حــكــمــەتــا ئــرشــادا صــافى هەر كەسىٚ كو ئەو بڤىٚ
دىٚ ژ تــرســا ڤــى خــودايــىٚ نــەفسا وى دىٚ گوڤگوڤى
نەفسا ناطق دىٚ ب سەربەست وەك برووسكىٚ پىٚ كەڤى
فــكــر وئــەفــكــارىٚ د دل دە هــەر وهــەر قــەط نانڤىٚ
جــەذبا ئــيــلاهــى ژ بانــى وىٚ ب ســەر دل دە وەرى

( الله الله ) كــو دبــيــٚژى ســرر وئــەخــفا تيٚنە دەر
ئــەو دبــىٚ ســوكــران ومــەستە ناڤا پيٚلىٚ سۆر وزەر
بــەيــرەق وئالا ب رٍەف رٍەف هاويــرى دل دانە سەر
پــورٍ عــەجــيٚبــە ئەم كوبار بن ئەم ژ ڤىٚ رٍىٚ بيٚنە دەر
داهــىيىٚ فــەقــير دپــورٍســى كــى ل مە كى مەهدەرى

( ١٠٥ )

# جهێ مه کوردا

جهێ مه کوردا     دەلال ورِندا
وەرن خەباتکەر     ب کۆم ولەشکەر
ئیرۆ رِۆژا مە     ڤایە گها مە
رِابوو ژ بەرزان     ئاڤێتە وەسطان
ناڤ چوویە وانێ     حەتا ئیرانێ
حودوودێ تەبریز     یەك یەك ببن رِێز
تا بگهی قارسێ     چما ناپورِسێ
حەتا طەرابزوون     تەڤ گول وبەیبوون
چەمێ سێواسێ     دەینن قیاسێ
حەتا سوێرەك     خۆرتێ چاڤ بەلەك
تا وێران شەهرێ     بگهیتە بەحرێ
ئەدەن وئۆرفە     مفتە وقولفە
ئۆرفایا دەلال     تا هەرِی شنگال
حەتا رەوەندز     سووسن ونێرگز
ناڤ چوویە کەرکووك     وێ هەر ببی بووك
ناڤا هەمەدان     هوون بگرن دیلان
جهێ شێرینی     حەتا قەزوینی
هەمی وەلاتە     گولا جڤاتە

گولێ ڕەنگینە     خۆرتێ جندینە
چیائێ بلند     حەمی مووم وفند
زاخۆ ومووصل     تەڤ بوونە بلبل
جۆدی وهەبلەر     سێڤێ سۆر وزەر
سیتە مقابل     چیائێ گوردل
فێکی شێرینن     وەك هنگڤینن
جهێ رەز وپەز     مێهڤانێ وا ئەز
خوزیا وی وەختی     هەڕم سەر تەختی
داهی تو ڕابە     چەهڤنێر سەرابە
ببە مێهڤانی     بژی بەرزانی

## (١٠٦)

# خۆرتێ کورد

خۆرتێ کورد خۆرتێ کورد هوون وەرن سەر چیا

مــوژدە بــێ مــوژدە بــێ ڤـا ئـالا هـاتــیيا

بــوو مــژ وبــوو دوومان جـەنگە شێرن ل ناڤ

بــدنــە پــێــش بــدنە پێش ئالا ڕەنــگــیيا

پــاطــە لــێــخــن ژ دل رستـەمی ساغ بکن

مــەیــدانــێ ســۆر بکن ژ وێ خوونا کوشتیيا

کــورد نــەبــەز کورد نەبەز تو کوڕێ رستەمی

بــکــنــە دەر دژمــنـا وا ژ مــێــرگ وچــیـا

لــەشــکــەرێ کــورد هـەیـە ڤا ل هیڤیيا وەیە

هــلــدانــە وا ل ژۆر ئـالا ســێ ڕەنـگــیـا

ڕەف ڕەفـا وی دهـات سـەر ســەرێ لەشکەری

ڕۆژا نــوو دەرکــەتــی ئـالایـا ڕەنــگــیـا

ڤـایــە داهــی دبــێ خــۆرتـێ کـورد تو نەبەز

جـانــفــدا جـانــفــدابــە ل سـەر سـەر چیا

( ١٠٧ )

# جـڤـاتـــێ

جـڤـاتـێ خـوەش جـڤاتێ		ل مـن خـوەش تـێ جڤاتێ
وەكـــی نـــێـرگـز ل لاتێ		بـــێ وی نـایـێ تـەبـاتـێ

جـڤـاتـا مـن ب ڕاسـتـی		نە كو ب حیلە ب قەستی
تو جا دل ژ وا نەشكەستی		ســـەر سـیـپـانـێ خەلاتێ

جـڤـات هـاتـە مـەیـدانێ		دا پـەی حـوكمێ قورئانێ
ئـــەون ئـــەهـلـێ ئیمانێ		بـایـــێ رەحـمـان ل وا تێ

بـایـێ رەحـمـێ هەژانـدن		یەك ب یەك ژەڤ قەتاندن
ل دونـــیـــایـــێ گـەڕاندن		بـــوون ئێسـیـرێ خەباتێ

بـــهـــار هـات ونـكـاری		بـوو هاڤـیـن ونـووبـاری
پـایـــیـــزێ مـــژ وتـاری		زسـتـانـــێ بەرف وبا تێ

زســـتـان سڕ وسـەرمایـە		پـیـر بـوو قووەت نەمایـە
زمـان د دەڤ بـــــەلایـــە		چووك شكەستی نووكا تێ

حـێستـر ژ چاڤا تێن خوار		روونـی نـەمـا بوو هەوار
شـــەڤ تـاری نـاڤ زنـار		نابـیـنـی تـــو وێ كاتـێ

( ١٠٨ )

## دلبەر بهارێ خەملی

دلــبــەر بـهارێ خــەمـلـی
وەر گــوهـ بـــدە ئـحسانە دل
نــێــرگــز د باغا کــەمـلـی
ســەرسـالـەئـێ نـیـشـانـە دل
ڕەنــگــێ ل سـەر سۆر وزەرن
کــەســك بوو د ناڤدە عەنبەرن
مـارێ چـیـا ژێ نـاقـــەرن
دەر کـانــیـیا مـەیـخـانــە دل
ماسی د بــەحـــرێ فەتسـیـن
شــێـــر وپـلــنـگ لـێ رەقسین
ڕووڤـی ژی قـەط پـێ ناحـەسین
ئــەو مــەیــدانـا شـێـرانە دل
ئەو لـەشکەرێ پوڕ ناڤ ودەنگ
ئـیـرۆ ل هاویـــر بـوویـە جەنگ
ڕەف ڕەف بـکی ئالا سێ ڕەنگ
وی چـاخــی مــن نـیـسانە دل

## (١٠٩)
# ئالا سێ ڕەنگ دباکی

ئالا سێ ڕەنگم		ب ناف ودەنگم
ئالا کوردا مە		ل هیڤیا خۆرتا مە
ئەزم ئالا تە		ئەزم مالا تە
سەر نە طەوینە		لەشکەر تو بینە
وەرە من هلدا		ب سەر بلندا
زولفا دو طاکە		ئالا ل باکە
وەرە بنێرا		مەعدەن وزێڕا
ئەزم دباکم		بسکا ل باکم
سووسن وەشاندن		نێرگز هەژاندن
خۆرتێ سر بلند		ئەزم مووم وفند
بوویە دەرەنگی		ما حەتا کەنگی
سەرێ خوە هلدی		هەڕی گۆڤەندی
باغێ وەسطانێ		حەیا رەوانێ
گۆڤەندێ خوەش کی		ئالا خوە گەش کی
کەرەمکە طووری		هەلدە ل ژۆری
خۆرتۆ ب مەش وەر		رەوەست وپێك وەر

( ١١٠ )

## چیائێ بلند ل سەر تالانن

چـــیـــائـــێ بـــلـــنـــد ل ســـەر تالانن　　زنـارێ نـاڤـــدە جـــهـــێ كـــەوانـــن
مـا حـــەتـــا كەنگی ئەم لـێ مێهڤانن　　رێـــكـــا مــــە دوورە ئـەم پـێ نـزانن
چـــیـــائـــێ بـــلـــنـــد ل سەر تالانن

چـــیـــائـــێ بـــلـــنـــد دار ودەڤـــینە　　نـــوالـــێ نـاڤـــدە مـێـرگ وكـانـیـنـە
مـا قـــەی ئـنـصـافە ئـەم ژێ رەڤینە　　بـــن دەسـتـێ دژمـــن ئەم بێ خوەیینـە
چـــیـــائـــێ بـلـنـد دار ودەڤـیـنـە

چـــیـــائـــێ بـلـنـد هەوا وا خوەش تێ　　بائێ شـمـال لـێ سەر گولا گەش تێ
دەنـــگـــێ بـلـبلا هاویر ب مەش تێ　　بـێـهـنـا ڤا باغا گەاەك من خوەش تێ
چـــیـــائـــێ بـلـنـد هەوا وا خوەش تێ

چـــیـــائـــێ بـلـنـد كـەو لـێ دخوینن　　دەنگێ وان خـوەش تێ لـێ ئەم نابینن
ل ســەر ڤـی رەنـگـی ئەم دلـبـرینن　　گـــول وكـولـیـلـكـا كەنگی دەرینن
چـــیـــائـــێ بـلـنـد كـەو لـێ دخوینن

چـــیـــائـــێ بـلـنـد رۆژ لـێ خوەیایە　　طـــاڤـــێ ددابـــوو بـەژنا خـــۆرتایـە
نـەقـشـا تـــو دەیـنـە ل شال وشاپایە　　چـاڤـێ تـە طـووری مـابـوو ل ئالایە
چـــیـــائـــێ بـلـنـد رۆژ لـێ خوەیایە

( ١١١ )

# رەحمەت ل گۆڕا شەهیدێ کوردا

شـــەهـــیـــدێ کـــوردا شـێـخ ومـەلانە
ئـــەمـــیـــر وبـــەگـــلـــەر کەسێ هێژانە
خـــۆرتـــێ جـــوانـمـێـــر ئـنـسانێ زانە
ســـەر ڕێـــکـا وەلات مـێـرخاس ومەردا
رەحـمـــەت ل گـــۆڕا شـــەهیدێ کوردا

ئـــەو جـانـفـدا بـوون سەر ڕێـیا ڕاستی
جـــەگـــەر حـــەلانـدن وا مایە هـەستی
ئـــەو چـــوونـە گـۆڕێ ب دل شکەستی
ئـــەو ڕێـیا ڕاسـتـی وان قـەط نـەبەردا
رەحـمـــەت ل گـــۆڕا شـــەهیدێ کوردا

شـــەهـــیـــدێ کـــوردا ئەو تەڤ برانە
گـــەر هـــوون نـــزانـــن تاریخ بەیانە
یـــێ هـــوون دزانـــن شـێـخێ هیزانە
ئـــەو دل بـــریـــن بـوو تەڤ خەم ودەردا
رەحـمـــەت ل گـــۆڕا شـــەهیدێ کوردا

دێـــرســـم وئـامـــەد شـەهید خویا بوون
بەدلیس وکەرکووك جەنگ لێ دوتا بوون
خـــەلات وبـازیـــد د بـــن دەسـتـا بوون
دلـێ ڤـا هـــــەمـــیـا داغ وکـەسەر دا
رەحـمـــەت ل گـــۆڕا شـــەهیدێ کوردا

طــووری تــو راِبـــه فـــاتــحه بـخوینه
دوعـائـــــێ تـازه د گـــــەل یـاســینـه
ل ســـەر رووحـــــێ وا شـــەهـیـدا بینـه
ئــەم ســەر نـشـووڤـن ژ شـــەرم ودەردا
رەحـمــەت ل گــۆڕا شــەهیدێ کوردا

( ١١٢ )

# کەرەم کە وەر دەر

دە فــەرمــۆ وەر دەر هــەرِە دیلانێ    گــولــێ ســۆر وزەر باڤــێ مەیدانێ
ژ پـوشـتا پەردێ زوکە خـوە دەر خە    تـڤـنـگ ورەخـتـە دەیـنە ل بەر خوە
کـۆمـا نــەیـارا ژ نـاڤ مـە دەرخـە    وێ ل هــیـڤـیـا تەنە خەلات ووانــێ
کـاڤـاش وکـاڤـار ســەر تـە دنـالن    بــەدلـیـس وبینگۆل ئیـرۆ بێ حالن
زارۆکـێ مـلـلـەت طـازی بێ مالن    چــەکـــی وا بـیـنـە ژ ناڤا باطمانــێ
بــەژن زراڤ وروو گــەش وگورجی    پیێ خوە یەك یەك باڤــێ دەرەنـجـی
تەختێ خوە دەینە ل سەر وێ بورجێ    ژ خــوە رِە بــنــێــرِە چەمێ رەوانێ
رِابــە ل سـەر خوە تو هەرِە سووکێ    بازارێ خوەش کە ل ناڤا کەرکووکێ
چیا بـخـەمـلـیـنـە ژ رِەنگێ بووکێ    گــۆڤــەنـدێ دەینە وێ ل هەمەدانێ
گـۆڤـەندێ رِاست کە تا بێلە چۆکێ    چـەنـگـا درێـژ کـە گـۆ ل نازرۆکێ
بـێـژە تــو رِابــە پـیــرێ پەپووکێ    دەنـگـێ گــولا تێ وێ ژ ئەردەهانێ
پــەرِێ گـۆڤەندێ پیێ خوە زەر کە    دەسـمـالـێ بگرە کولـێ خوە دەر کە
بــدە تــلــیــلــی داهـی کەرەم کە    تازە بـنـێــرِە تــو ل کـــەســرەوانێ
کـــەرەم کـــە وەر دەر هـەرِە دیلانێ    گـولـێ سـۆر وزەر باڤــێ مـەیدانێ

## ( ١١٣ )
# دلبەرگەلەك شیرینە

دلــبــەر گـــەلـــەك شـیـریـنـە كـوردستانا كوردایە
تـەڤ شـانـــی هـنـگـڤـیـنـە ل سـەر دلـی خۆرتایە
ئـــەرزەرۆم ، قارس پوشتـن مووش وسەرا تەنشتـن
گـەلـەك سـەر هاتنە كوشتـن سیپان سەری مەمكایە
رەخـــی چـەپـی ئـــەو وانـــە بـــەزی سنگی هیزانە
نـاڤـا مـەمـكـا وەسـطـانـە بـەدلـیـس پوولـی ملایە
رەخـــی راسـتـی بینگۆلە خۆرتی دەلال چوون هۆلـە
كـیـفـا لـــەشـكـەر داهــۆلـــە بازید مویی بسكایە
خـــویـــنـــە وی دیاربـەكـر طەعما وی شیر وشەكر
خـــۆرت رابـــە لـی بـفـەكـر باطـمـان ناڤا دلایـــە
باشـكـالـە بوو كەزیا زەر رەنگی وی شاغ وهەبلەر
دژمـنـا ژی كـــرم دەر بــــوومـــە وەحشی چۆلایە
دیرسم دبـوو چەنگی وی كەركووكە ئەو لـنگی وی
بـــەرزان ب خـــوە جەنگی وی شنگال سەری تلیایە
گـــورچـــك دبــــوو كـاڤـارا رۆژ وشەڤی زارزارە
د بـن دەســـتـــی نـــەیـارا ئـانـــی هـەیـڤا چاردایە
مـا بـــن دەستی نەیاری كوردی مە بوون سەد پاری
نابـــیـــژن كـا هــــەكـاری رووی سـپــی نـەمایە

سولەیمانی گوهارا سیت وجۆدی زنارا

پور دمیهتن نەیارا گەلۆ کا جانفدایە

کوردۆ سەری خوە هلدە وەلاتی تە تەڤ فندە

بنیر باژار وگوندە دژمنا لی پالدایە

کوردی دل پاقژ رابن ژ بۆ داهی برا بن

تەڤ چاڤنیری ئالا بن بەرزانی ڤا هلدایە

( ١١٤ )

# چيائى كوردستانى

چـــيـــائـــى كـــوردستانـــى حەمى ميرگ وكانيـــنه
ل دۆرا بـــەحـــرا وانـــى تـــەڤ سيـڤى خـــەلاتينه
بـــنـــيـــر ئـاڤـا رەوانـــى ناڤ دا قاز وقـومـرينه
حـــەتـــا بـاغـى وەسطانـى سووسن ل ميـرگه شينه
وەلاتـــى تـــه تـــەڤ زيـرا ناڤا جهان گـــولا گەش
ســـەرى چـــيـــا بـــنـــيـرا ڤا نيرگز وبيـهنا خوەش
خوناڤ وعەنبەر پـيـرا بـەلاڤه سەر مسكـا رەش
بايى شـــمـــال لـــى خـــيـرا پى كلدانه چاڤـى رەش
گـــريـى مه تى ل حالـــى مـــه د بن دەستى نەيارى
ئاگـــر كەتيه دلـــى مه هوون ژەڤ دبن سەد پارى
خۆرت وجان وكالـــى مه بەس لـەڤ بكن نەيارى
كـــوردســـتـــانـــه مـالـــى مـــه سەر بوويه مژ وتارى
هـــەيـڤـا ئادار ونـــيـــســـان خبات تيده گەراندن
كوردا سەرى خوە هلدان چەنگى دژمن شكاندن
ئـــەو بوو ســـەرسالا كوردان سەرى دژمن فراندن
كـــەيـــف وســـەيرانا خۆرتان وەلاتى خوە ستاندن
داهـــى زەنـدى خوە هلده ژ جەنگى را ل كار به
وەلاتـــى تـــه تەڤ فنده شەڤ ورۆژى گوهدار به
ســـەرى ريـــبـــەر بلنده وەكى شيـــرا غەدار به
چاڤێ خۆرتێ مه كل ده و ڕابـــەرێ نـــەيـار بـه

( ١١٥ )

# خۆرتۆ كوردۆ تو ڕابە

خـۆرتـۆ كوردۆ تو وەر وەر گـەر تو دخوازی یەك ڕێبەر
بــەرزانــی ڤـایــە سەروەر دژمــن ژ جـــه دكـــی دەر
ب تـەنگ وتـۆپ لـەشكەر

خـۆرتـێ كـوردا شیار بوون ژ بـۆ جەنگی ئەو كار بوون
وەكـی شـــێـرا غەدار بوون دەربـــێ وا پـورِ دژوار بوون
تـۆپ وتـڤـنـگ وخەنـجەر

گـــورزێ رســـتـــەم هلینن دەشـــت وچـیـا بـــســتـیـنن
چـەنــگـێ دژمـن بشكینن كـــــوردسـتـانــێ دەریـــنـــن
كـــوردســتـانـا ســۆر وزەر

هـــەڕنـــە حـەیـفـا شەهیدا وا مـــێـــرخـاس وعـەگـیـدا
دژمـــن بـــگـــرە ل سـیـریدا ئـــەو حـەیـفـا شێخ سەعیدا
ئـالا ڕەنـــگـی هـلدن سەر

چـێــكـن جـەژنا نـیـرۆزێ ژەڤــرِە بـــدن یـەك سـۆزێ
ســـوار بـكـن هـوون بۆزێ بـێـژن سـەد جار پـیـرۆزێ
خـەمـلـە بووكێ دەینن سەر

بـــووكـە مـە خـوین شێرینە كـــوردســتـانـا ڕەنـــگـینە
خـــوازگـیـنـی ڕوونـشـتینە قــەلــەن خـــویـنی دەرینە
طـــووری ڤـایـە ل پـێـشبەر

( ١١٦ )

# پاتەخوەر

ئـــيـــرۆ دبـێـژم هــەی هــەوار  کــا لــەشـکــەر وکـۆمـێ گران
دژمـــنـــا کـــوردسـتان دخوار  ڤـايـە چـێـبـوويـە بـێ گـومان

ئەی خۆرتێ کوردێ پورِ جوان  پــورِ بــۆريـنـە سـال وزەمـان
کوردێ مە بن ظولــمێ دە مان  عـــەقـــلـــێ هنا عەقلێ کەران

وەخـــتـــێ کەر چاڤ ئێمی دکی  فـــيـق فـيـق وزرِزرِ ئەو دکی
کەيفا خوە ب ئێمی خوەش دکی  زانـــی بـاری پـــێ بـێ گران

هـــن چـــەتــەنــە هــن پاتــەخوەر  ناڤ تــــيـــــپـــێ دژمن دانە دەر
ســەر کـوردستان گـرتن چەپەر  حەتـتـا کـو ئـەو چوويە ئيران

يــەك جـارێ دی تـو لــێ بـنـێرِ  ڤـايـە خــويـايــە سەر ديـێر
تــەڤ وەرنە جەنگێ خۆرتە شێر  حەتـتـا کـو دژمـن بێ ئەمان

( ١١٧ )

## هەی دۆستە شەنگی

هەی دۆستە شەنگی     ب ناف ودەنگی
پوشتی کو بمرم     ما تو چ ڕەنگی
ئالایی هلدە     کەرەم کە بانی
خەملە وەلاتە     خەملە کوردانی
بێژن هەی بژی     شێرێ بەرزانی
سەر سەرێ چیا     تم تو ب تڤنگی
هەی دۆستە شەنگی

خەملە وەلاتە     هاتە پێشبەر مە
جەژنا نیرۆزێ     دەینە ل سەر مە
خۆرتێ مە کوردا     ما قەی نەشەرمە
تەڤدە هوون ڕابن     بوویە دەرەنگی
هەی دۆستە شەنگی

ڕۆژا مە دەرکەت     شەوق چوویە کەرکووک
وەلات دباکێ     ڤا ئەز دبم بووک
تەڤ وەرنە جەنگێ     داخواز و ب چووک
زولفا هەژینن     ما حەیا کەنگی
هەی دۆستە شەنگی

داهی دبێژی     وەرن مەیدانێ
جەنگە شێرایە     هەر کەس دزانێ
ل مە پیرۆز کن     ئیرۆ کتانێ
د باغێ کوردا     رەیحانە ڕەنگی
هەی دۆستە شەنگی

( ۱۱۸ )

# کوردیێ مە گەر کو ڕابن

کوردیێ مە گەر کو ڕابن ژەڤرە حەمی برا بن
ویێ ب داخوازا خوە شا بن وپێشبەری ئالا بن

خۆرتۆ ڕابە بنێڕا ل تۆپا گوه بدێرا
جهیێ تە ما ژ کیێ ڕا سەر تەواندن نەخێرا

ڕوویێ تە ئاڤ وچەرمە خوینە تە هەوقا گەرمە
زمانیێ تە پوڕ نەرمە ما قەی ژ تە ڕە نە شەرمە

ل ناڤ گوندا عەزیزن ژ بۆ جەنگیێ سەر حیزن
دژمن ب تە دلەییزن بۆ خوارنیێ خوەش دیزن

دەما چاخا بهارا جەژنا خوە دا نەیارا
تو سێوی ل بەر دیوارا ڕۆژ وشەڤیێ زارزارە

کوردستانە مالیێ مە جەنگ وشەڕ هەر کاریێ مە
باریێ مەزن باریێ مە ترکێن پیس نەیاریێ مە

کانی دەشت وکا زۆزان کا کەرکووك وکا باطمان
کانی قارس وکانی وان دژمنیێ تە لیێ گهان

کانی شاغ وکا هەبلەر      کا مەرەشە وێران شەهر
کا مەلەطیە بوغچێ زەر      دژمنا ژێ کرم دەر

کانی ئۆرفا کا ماردین      کا زۆزانێ شەرەفدین
کا بازید ودیادین      دژمنێ تە لێ جڤین

کا جەزیر وکا هەزەخ      کانی سێرت وکا شەرنەخ
کانی مکس وکا هەورەخ      دژمنێ تە کەتن رەخ

کا طەرەبزوون ئەردهان      کا سیواس وئازرگان
کانی چیا کا وەسطان      کا بەدلیس وکا هیزان

کانی دەحلێ خوەش ورند      کا مەعدەن ومووم وفند
کا زنارێ تم بلند      داهی تەنی بوویە کوند

## ( ١١٩ )

# پیرا سەر گژ

دونــیـا ل مـن دبـوو مژ دەمـا هـات پـیـرا سەر گـژ
داریَ ویَ سـەر ملیَ ویَ تـــەوانـدی هـنـگلیَ ویَ
بــوو شـەقـشـەقـا دنانـە بــرووسـكـا ژیَ ڤــەدانــە
دنـانـــیَ ویَ سـپـیـنـە چـاڤــیَ ویَ دەر كــەتـیـنـە
نـەیـنـۆكــیَ ویَ دریَـژن دەسـت وپـیَ تەڤ قەریَـژن
ڕەنـگیَ پـیـریَ ڕەش وقیر چـیـریَ ل مـن بوو ئەمـیـر
دەمــا گــهـابـوو گـوندا بـاكــر دەنـگـیَ خوە هلدا
ئــەزم پــیـــرا د ڕیَ دا ئـــەزم شـاهــیَ دنــیَ دا
ل ئـانــیـا مـــن بـنـیَـڕا حـــەمــی مـرجـان وزیَـڕا
ڕەنـگیَ پـیـریَ ڕەش وقیر پـــیـــریَ ل من بوو ئەمـیـر
وەرن پـیَـخـواس وطـازی كــی ویَ بیَ من بـخوازی
ئــەم دڕابوون پیَ كەنـیـن ژ ڤـیَ پـیـریَ ئـەم ڕەڤـیـن
حـەتا مـن پـیـریَ ناس كر من عومریَ خوە خلاس كر
پـیـریَ ل مــن دبـوو شاه داهـــی ژ بـــەر ئاه وئاه

( ١٢٠ )

## پیرا گوهـ گوهار

گــەلـی بـــرا دبـــێـــژم　　ژ بـــــەر دەرد ومـــطـــالـــە
ئـــەز نە لالـم نـە گـێـــژم　　داغـا ل دل كـــــۆپـــالـــە
ئـــەولە نـــەبـــە تـو ل نەیار　　نـە پـایـــیـــزا لـێ بـــهـار
وەكـــی پـــیـرا گـوهـ گوهار　　فــكـــــر وحـیـل وخـیـالە
وەختێ ب تە ڕا خەبەر دی　　سـی كـەسـەرە ژ دل بەردی
حـــێــســتــر ژ چاڤا بـــەردی　　خـــوە دكـی وەكی عەبدالە
ئـــەو تـــزبـــیـا دهـەژینـی　　حێـسـتـرێ خـوە دڕژینی
پـورِ جـامـــێـــرا دخاپـیـنی　　بـــەرێ وا دا نـاڤ چـالـە
ئـــەو ژ خـــودێ نـاتـــرسـی　　بــــەرێ خـوە دایـە قودسی
ژ كـــەســــەكـــی ناپـوڕسـی　　كـەتـیـە كـاش وكەندالە
ل كـــەنــــدالــە حـــەیـیـری　　ســـەر حـالـێ خوە دگری
ل دونـــیـــائـــێ فـــــكـری　　دونـیـا پـــووچ وبـەطـالـە
دونـــیـــا ل مـــن بــوو تـاری　　پــورِ ل مـن كـــر نـەیاری
ئـــەم هـــەر دكــــن زارزاری　　طـــووری مـا بــێ هەڤالە

( ١٢١ )

# نـــــەورۆز

چـــاخـــا بـــهـــارێ     هــــات وپـــيـــرۆزا
هـــەيـــڤـــا ئـــادارێ     تـــێـــدا نـــيـــرۆزا
خـــونـــاڤ دبـــارى     هـــــلانـــــى تـــۆزا
ديـــــلان ل كـــــارى     تــــەڤ گـــەور وبـــۆزا

بـــيـــست ويەكى وى     ئـــاگـــــر دارانــــــە
د نـــاڤ چـــەكـــێ وى     ئـــالا هــــلــــدانــــە
ژ بـــــۆ رێـــــكـــێ وى     چــــــوونــــــە زۆزانـــە
ل نـــاڤ هـــێـــكـــێ وى     گـــەشـــت وســـەيـــرانە

ديـــســـا ب خـــێـــر هات     ئـــەو جـــەژنـــا كـــوردا
شـــــاهــــيــــنـــــا وەلات     ژ بـــــــۆ مـــــە دەردا
هـــــاتـــــن لـــێ خەبات     مـــێـــرخـــاس ومـــەردا
خوەش بوو لـــێ جڤات     ئـــەيـــوان وعـــەردا

ئـــادارا رەنـــــگـــــى     شـــيــــن وشـــێـــريـــنـــە
ســـووســـن ونـــێـــرگـــز     هــــەردو كــــەنـــيـــنـــە
خـــونـــاڤ وعـــەنـــبەر     تـــێـــــدە فــــــۆريـــنـــە
هــــەر ســێ نيـــشـــانـــێ     ئـــالا رەنـــگــــيــــــنــــە

وەرنە دیلانێ     ئاگر دادانە
باغێ وەسطانێ     گەشت وسەیرانە
حەتا ئیرانێ     جندی خویانە
تا بگهی کەرکووك     جهێ کوردانە

ضوحاکێ خوینخوار     ضوحاکێ بیژی
پوشتێ دە دو مار     دەرمان بوو مێژی
کاوا بوو رادار     ئاڤێتە وی ژی
سەری ئانی خوار     ئەو بوویە رێژی
کوشتن سەکێ هار     نوکە گژگێژی
ئەو بوو چەندی جار     کوردستان دژی

( ١٢٢ )

## هاتنه جردا ل ناڤ فراغا

دبـێـژم ئـەی گـەلـی ئـەهلێ جڤاتێ
بـنـێـڕن هـوون ل دورانـێ چ با تـێ
عجاج ڕابوو ژ عەردێ تۆز ب هەوا کەت
مـە لـێ نـێـڕی قـفلەك جراد پەیا تێ
د نـاڤـا وا قـومـانـدار ویـۆزباشـی
و ئـۆبـیـن باشـی هجووم دانـه زغاتێ
مـه دی گـوهـ بـەل ناڤ فـراغا وەر بو
بـوویـه تـەق تەق خەوا من قەط نەما تێ
دچـی وتـێ د مـالـێ دا ب ل خوەش
چ بـێـژم ئـەز ژ حالـێ کـێـفـەراتـێ
مـه دی مشکك ژ کونجێ ئەو ب دەرکەت
گـۆ : خـوەش گەلدی برا هەر پیره فاتێ
بـەلەك سـۆر بـوو د نـاڤـا وا خویا کر
بـوویـه دوومان خـەوا من قەط نەما تێ
درێـژ دووف بـوو ل عـەزمانا خـویا کر
مـژ ومـووران ل مـن هەر بەرف وبا تێ
مـه دی جـردەك دهاتی دووف هەژاندی
ل هـاویـری هـنـەك دکـن لقاتـێ
گـۆڤـەنـدا خـوه د خێنێ دا گەڕاندن
کـو ڕاست وچەپ تلیلی خوەش ل وا تێ

هـوون شـەرم نـاكـن ژ ڤا جرد و ژ مشكا
كـو چـاوا تـــێ ل وه صـــەبـــر وتـەباتێ
بـــــەســــــە داهــــى كـــەسێ زانه دزانى
بـــرا ڕابـــــن ژ خـــوه ڕه بـكن خەباتێ

# ل سەر وەفاتا سەیدایێ سەرۆك
# مەلا موصطەفا بەرزانی

موصطەفا بەرزان موصطەفا بەرزان
ساغ بی مری بی سەرەکێ کوردان
هەوارە هەوار کا باڤێ لوقمان
ل من وندا بوو گولا کوردستان
سەیدا ڕێبەر بوو ڕێبەرێ کوردا
زەعیم وسەرەك خوەش ناڤ بلندا
حەیف ومخابن کول ما د دل دا
رەحمەت ل وی بێ ئەم مانە شووندا

موصطەفا بەرزان موصطەفا بەرزان
ساغ بی مری بی سەرەکێ کوردان
بیست ڕۆژ دما بوون ژ جەژنا نیرۆز
تابووتا سەرۆك لێ بوویە پیرۆز
ئەم سەر دنالن هەر شەب وهەر رۆژ
فەلەك نەیار بوو کول هشتە دل دا
موصطەفا بەرزان موصطەفا بەرزان
ساغ بی مری بی سەرەکێ کوردان
ڕابە ژ گۆڕێ زەندێ خوە دەر خە
تڤنگ ورەختە دەینە ل بەر خوە

کـــۆمــا نـــەیــارا ژ نـاڤ مـە دەر خە
ب زەنـــدێ نـــازك ئـــالا خـــوە هـلـدە

مـوصـطـەفـا بـــەرزان مـــوصـطـەفا بەرزان
ســـاغ بـــی مـــری بـــی ســەرەکێ کوردان
مـــوصـــطـــەفا بـــەرزان تو خوەش غەریبی
کـــوردێ ب ڕاستی وی چاڤ ل گری بی
کوردێ سەرحیز بێ وێ چاڤ ل هەستی بی
چـــکـــو ژ نـاڤ وان تـــە ڕابـــوو فـر دا

مـوصـطـەفـا بـــەرزان مـــوصـطـەفا بەرزان
ســـاغ بـــی مـــری بـــی ســەرەکێ کوردان
ئـــیـــرۆ د بـــاکـــم پـــیـــژنـا تـە نایێ
ڕابـــە ژ گـــۆڕێ بـــچـــنـــە سـەرایێ
کـــولـــێ د دل دا بـــــدنـــــە هـــەوایـێ
کـــوردا ل ئـــیـــران ئـــیـــرۆ وا حـلدا

مـوصـطـەفـا بـــەرزان مـــوصـطـەفا بەرزان
ســـاغ بـــی مـــری بـــی ســەرەکێ کوردان
ئـــیـــرۆ ژ ئـــیـــران ڕۆژا مـــە دەرکەت
ڕەش وا هـــلانـــیـــن ســـەر سەرێ مللەت
مـــزگـــیـــن ژ بـــۆ تـــە وێ بـبـنە دەولـەت
چـــاڤـــێ کـــوردســـتـــان ڕابە تو کل دا

مـوصـطـەفـا بــەرزان مــوصـطـەفا بەرزان
ســا غ بــی مــری بــی ســەرەکێ کوردان
کــــوردا ل ئــیـــران حـــەفـلـه ددانیـن
ئـــەمــرێ خـــودا هات قەط پـیێ نزانیـن
ژ نـاڤـا دیـــوان کـــورســـی هلانـیـن
نـــزانــــم کــــی وێ ڕوونــــی د مل دا

مـوصـطـەفـا بــەرزان مــوصـطـەفا بەرزان
ســا غ بــی مــری بــی ســەرەکێ کوردان
ئــالایــا ڕەنـــگـــی دانــه تـەنـشـتـێ
دلـێ خـــوه گـــەش کــه بـاغـێ بهشتێ
دەورانـــه دنـــیـا کـــەســـەك نـەگشتێ
هــــەوارا داهـــــی مــایـــه د دل دا

مـوصـطـەفـا بــەرزان مــوصـطـەفا بەرزان
ســا غ بــی مــری بــی ســەرەکێ کوردان
ســالا هـــەزار ونـــه ســـەد هــژماری
هــــەفـــتــــێ ونـهـا بــوو یەکی ئاداری
بـــولـــبـــول دخـــویـــنـی دایـه هەواری
ســـەرەکـــێ کـــوردا چــوویـه مەزاری
بــهــــارا شــیــــنـــه شــیـــــنه شێرینه
ســــووســــن ونـــێـــرگـــز تـێـدا فـۆرینه
نــەغـــمـا بــولــبـول بـوو بولبولـێ دینه
حــێـــســـتــر ژ چاڤا خـوەش خوەش بارینه

هـــەر ڕۆژ وهـــەر شـەڤ ئـەز لـێ دخوینم

هـــەر چـاخ وهـــەر دەم ئـــەز دلبـریـنم

داغـــێ ل ســـــەر دل چـــاوا کـــــەویـنم

بـکـــێ کـــو ڕابـــم ئـــەز حـەق بـستینم

مـوصـطـەفـا بـــەرزان مـــوصـطـەفا بەرزان

ســـاغ بـــی مـــری بـــی ســەرەکێ کوردان

## ( ١٢٤ )

# بوغچیێ غەما

مـا ئــەز چ بـێــژم دونــیـا وەسایە
رۆژ وشــەڤــێ هــەر دەرد وبەلایە

گولا من گەش بوو ڕەنگ لـێ نەمایە
پــەلــێ دارا مــن یـەك یـەك وەشایە

کـەتـم ڤـی بــەری دەشـت وپیلا دە
دلــێ مــن هوور بوو د ناڤ کولا دە

داغـێ ل سـەر دل ڕاست وچەپ بادە
تـەنــێ غــەریـبــم د ناڤ گشا دە

غـەریـبـێ تــربــێ هــەوقـا دژوارن
جــڤــاتــە من تەڤ ئەو مشك ومارن

گۆشتێ لاشێ من هوور هوور دخوارن
هــاویــر دنــێــڕم حــەمـی نەیارن

ئــەو تــەڤ بـرا چوون حەمی مرینە
ڕابــە ل ســەر خــوە چ دل تەوینە

دۆرا مــن هات وجەرگێ مـن خوینە
دەردێ مــن زۆرە هـنـاڤ کـەلـینـە

خــودا ئــەمـر کر ئەز پـێ رازیـمـە
ئــەگــەر کـو ساغم ب دل مریـمـە

ئــەز گــونــهـکـارم ئەزێ طـازیـمـە
بــوغـچـێ غەمامە ئەز بێ خوەیی مە

فـەلـەکـە وێـران چەرخەك هەژاندی
دەربــەك ددانـی گـورچك کەلاندی

کــەیـف وسەیران وی ژ دل هلاندی
عـشـقـا شـێـرین بوو داهی حەباندی

( ١٢٥ )

# ئەى دلۆ عارف

ئـــەى دلـــۆ عـارف كـانـى ژىَ دزيَن نيل وفرات
سەيحوون وجەيحوون ل بانى دانە بانگ وصەلـەوات
( جنة الفردوس ) دباكى ئەى گەلـى ئيسلام تەڤ
حـــوور وولـــــدان ل غـــورفـا بـوونە ئەو قائمات
هـــوون وەرن ئـەهلىَ ديانـىَ تەڤ بىن صافى ژ دل
( جـنـة المأوى ) سەلام كارا ل رووح وهەم ل ذات
ذاتـــىَ نوورانى ل سەر دل وى ب چاڤىَ خوە ددى
بـــەرقا ئالا بوو ل طوورى ژيَـرِە هاتى بوو خەلات
ما كى دىَ سەر هش بـمـيـنىَ كو ببينن ذەررەيەك
( جنة الخلد ) ىَ دخوازى ماچيە ئەڤ كـيَـفەرات

( ١٢٦ )

# کەس گوهدارێ مە نینە

گەلەك ئیرۆ دبێژم     کەس گوهدارێ مە نینە
مێلاکێ خوە دبرێژم     دلێ من هەر بخوینە

ڕابە ژ خەو شیار بە     نە غەملیس وسەرسار بە
ل دۆستێ ڕاست گوهدار بە     دۆستانی پورِ شێرینە

دۆستانی هەر وەخت نایێ     بنێرِ پێلێ دونیایێ
ڕۆژا ( قالوا بلی ) یێ     نەخوشم حال تو نینە

نەخوەشیا مە خەرابە     جانێ مە دا عەذابە
دلێ مە دچی کەبابە     فرنگ دەستێ مە نینە

گەلی برا بنێرِن     مەعنا شعرا هلدێرن
هنەك زیڤ وهن زێرِن     کەس موشتەریێ وان نینە

کەس نزانی کو چیە     دونیایە هەر فانیە
ئەمرێ خودا هاتیە     مەجال ژ بەر تو نینە

هەچی عشقەك حەباندی     ل دونیایێ گەڕاندی
دلێ داهی حەلاندی     خوون ناسەکنی ل برینە

## ( ١٢٧ )

# دبێژم ئەی گەلی گوهدار

دبێژم ئەی گەلی گوهدار ل ڤێ دەورانە دونیایە
دنێرم وەی کەسێ هشیار غەریقێ ناڤا پێلایە

ئەوەل دونیا چ شیرین بوو د ناڤ دە نال وئایین بوو
ل تالی ئەو رەش وشین بوو دبووم نیشانە بەلایە

نیشانا لۆمەیا ئەز بووم شەمالا موومیا ئەز بووم
عەفارا حەمیا ئەز بووم دل وگورچك دبوون کایە

ژ ناڤا دل زوا بوومە د چۆل وبەری وەر بوومە
ل بەر دارا چیا بوومە ل بەر ڤێ سرِ وسەرمایە

برا چوونە تەنێ مایی د ناڤ دینا دە پالدایی
ب رەنگێ وەحشێ چۆلایی خوەشی وکەیفا تە نەمایە

خوشی وکەیفا تە هەر چوونە ژ جەرگی ئەو زوابوونە
وەکی دارا رزی بوومە ب زارزاری نەی ونایە

نەی ونایە ب زارزاری دل وجانێ مە خوین خواری
ژ بەر تربا رەش وتاری ب حال ورەنگێ وەحشایە

ژ بـەر دربا بــێ حـال ورەنـگ		وەكی طەیرێ بێ چەنگ ولـەنگ
مـە دەرد بوو بەیرەقا سێ ڕەنگ		كـو ئـــەو ڕەنگ هەر ل دل مایە

چــقـــا بـــێـــژی تـو نـابینی		وەكـــی دەردێ مـــەم وزیـنی
وەكــــی فـــەرهـاد وشێرینی		ب وێ قـــەهـــرێ داهـی مایە

( ١٢٨ )

# دۆستیێ دەلال وندا بوو

دۆستیێ دەلال وندا بوون ل پەی وا بوو هەوارا
ل هاویر من نەخویا بوون ما مە ل بەر دیوارا

گرییێ مە تێ ل حالێ مە ئاگر کەتیە دلێ مە
ڕۆژ وشەڤێ نالی مە دل دابوونە زارزارا

ناڤا دل پوڕ زارزار کر گەمی ل ئاڤێ کار کر
قەنجا ژ نك مە بار کر تەنێ مامە ل وارا

وارێ من خڕ وخالی یەك ژی نەما ل ڤی ئالی
برا تەڤ چوون وی ئالی دەردێ وا پوڕ غەدارا

دەردێ غەدار ب عشقێ چقا بکێشی مەشقێ
نابینیتن وەك بەرقێ ژ بالا تێنە خوارا

عومر هات و ب لەز چوو هاویری دل ژی بەز چوو
بولبول ل سەر هەوەز چوو ل سەعفەص بوو گوهدارا

باغ وبوستانێ ڕەنگی هەر هەر ب ناف ودەنگی
داهی بوویە دەرەنگی تەنێ مایی بێ کارا

( ١٢٩ )

## طـــووری

طــووری طــــووری طـووری　　مال مـــيــــراتــۆ ما تە کـۆری
تـە سـەر خەف کی رە دبۆری　　تـــە چـــووی مـريـشکا ژۆری

حـــەيـــوان هـــات ودلـەزينی　　خـوە ب حـەوشێ ڤە دگەهينی
مـــريـــشــکـــا ڕەش دنـقـينی　　لـــێ عەيشێ ب خوە ناحەسينی

مـــريـــشــکـــێ قـيـژە قـيژە　　حـــــەيـــوان تـاڤـێــژە قـيژە
مـــەلا رەســــوول هـاتــبـوو　　ئـانـــــی دارەك گـــــوهـــيـــژە
دارەك طــــووری وەرتـانـــــی　　لـــێ لنگ سرسيری کرنە پيێژە

طــووری طــــووری طـووری　　مال مـــيــــراتــۆ ما تە کـۆری
تـە سـەر خەف کی رە دبۆری　　تـــە چـــووی مـريـشکا ژۆری

طــووری هـــاتـی ژ بەر چايێ　　حـــەيـــوان هاتی ژ بەر چايـێ
مـــلـــــی قــــێـــڕيـن ددايـێ　　ئـــــەمــــێ طــووری بـکوژن
لـــێ حـەيـفا مريشکا عەيشايێ

خــــفــــکـــا عـەڤـدی سليمانا　　خـــــفـــــکــــا وی تــێــر دنانا
ل بــــــەر طــــووری ڤــــەدانـا　　شـــــەڤ کـەتـيـە نـيڤی شەڤێ
ل ســـــەرێ طــــووری فەرمان　　طــــووری طــــووری طـووری

# فەرهەنگۆك [1]

ئـاپــۆ ( ئاپ ) : مام ( العم ) .

ئار : ئاگر ( النار ) .

ئازار : عەزاب ، نەخۆشى .

ئاژار : بــەرهــەم ودەرامــەتىٚ عەردى ( محصول الأرض ) .

ئەصلان : شێر ، ووەك كينايەت بۆ چاڤان يان كەزىیان دئێته ب كارئينــان ( الأسـد ، ويكنى به عن العيون والظفائر ) .

ئەولـه : باوەرى ( الثقة ) .

ئێگر : ئاگر ( النار ) .

بـاپـووك : ئــەو بــايىٚ بەفـر د گەل دا ( الريح المصحوبة بالثلج ) .

بـرچى : برسى ( جائع ) .

بۆز : ڕەنـگـىٚ ب سـەر سـپـى ڤە بچت ( أشقر على البياض ) .

پـارس ( پارسەكى ) : خازۆكى ، گەدايى ( التكدية ) .

پاره : پارچه ( قطعة ) .

پـژيـن ( پژاندن ) : لێنان ( الطبخ ) .

پـسـيـك : پشيك ( القطة ) .

پـۆز : دفن ، كەپوو ( الأنف ) .

پـوول پـەرست : دەرهەم پەرێس ( عابد النقود ) .

پەپووك : طەيركىٚ سليمان پێغەمبەرى ، هوهود ( طائر الهدهد ) .

---

(١) بۆ بەرهەڤكرنا ڤىٚ فەرهەنگۆكىٚ مه مفا ژ فەرهەنگا ( الهدية الحميدية ) يا ضيـاء پاشـا الخـالـدى ، وفەرهەنگا ( ژين ) يا محمد جميل سەيدا ، وفەرهەنگا ( هەنبانه بۆرينه ) يا هەژارى ديتيه .

پەروازە ( پەروازدان ) : ل دۆر زڤـــڕيـن ( التحليق ) و ب ڕامانا چارچووڤـەيـــى ژى دئێت ( الإطار ) .
پەيا پەى : ل دويڤ ئێك ( متعاقب ) .
پـێـت وپـرنـگ : گـــوڕى وپەلا ئاگرى ( اللهب والجمرة ) .
تاپان : داسا مەزن ( المنجل الكبير ) .
ترح : ئـــەو چەقێ ژ قورمێ دارێ دچت ( الفرع النامي من جذع الشجرة ) .
تەواند : پێچا ( طواه ) .
تووتاك : ڕەنـگـەكـێ طەيرانە ( طائر القمري ) .
جندى : مێرخاس ( شجاع ) .
جەبان ( جەفان ) : گۆڕ ، تربە ( القبر ، المقبرة ) .
چـــووك : چويچك ( العصفور ) .
چەشم : چاڤ ( العين ) .
چەن : ئەرزنك ( الذقن ) .
چورخە : ساگۆ ( المعطف ) .
چووت : ڤەجوين ( المضغ ) .
چيچەك : گول .
خار : سترى ( شوك ) .
خۆز : قۆز ، پشت خوار ( أحدب ) .
خەدەنگ : تير ( السهم ) .
خەريدار : بكڕ ( مشتـري ) .
دبستان : خواندنگەھ ( مدرسة ) .
دۆژەھـ : جەهنەم ( جهنم ) .
دەرگووش : لاندك ( المهد ) .
رەوان : ڕێڤەچوونا ب لەز وبەز يا رەهوان ( الجري بين المشي والعدو ) .

زەبوون : بەنی ، کۆلـە ( العبد ) .

زۆخ : کـێـم وعــەداف ( الـقـيـح والصديد ) .

زير وزبەر : ژێر وژۆر ( قلب العالي سافلاً والسافل عالياً ) .

سەرگەردە : حێبەتی ( حائر ) .

سەما : لـەییزتن ( رقص ) .

سـيـفـل ( سـيـفـيـل ) : بیّ خێریّ بیّ بها ( الحقير السفيل ) .

شکێر : جهیّ حەلان بت ژ چیایی ، وبۆ کێلـییّ ژی دئێتە گۆتن ( الأمـاكن الصخريـة من الجبال ، وقد يطلق على شاهد القبر أيضاً ) .

شل : تەڕ ( مبلول ) .

شـمـامـۆك : گوندۆر ( البطيخ الأصفر )

شەعلوول : شالیل ( الشحرور ) .

شەڤگەر : ئەویّ ب شەڤیّ ب رێڤە دچت ( الساري ) .

طوور : گوندەکیّ بۆتانە ( قرية في نواحي بوطان ) .

عەزمان : عەسمان ، ئاسمان ( السماء ) .

غەوثــیّ غەیدا : سەید ( صبغه الله ) یّ هیزانییە ئــەویّ ب ناسـناڤیّ غەوسـیّ هـیزانی دئێتە ناسین ، وغەیدا ئەو جهە ییّ لـیّ هاتییە ڤەشارتن ( من شيوخ التصوف ) .

ڤژگ : سەرڤژاڤژ ( منفوش الرأس ) .

قـۆف : پشت خوار ( محدودب ) .

قول : کون ( ثقب ) .

قـەپال : پرت پرت ( خرق ) .

قەراش : ئاشەڤان ، ئەویّ ب هێرانیّ ڕادبت ( طحان ) .

قەلـەن : نەخت ( صداق ، مهر ) .

کوتابـی : خویندکار ، قوتابی ( الكتابي ، طالب العلم ) .

کوفلـەت : ژن ، کابانی ( ربة البيت ) .

كـونـد : بوم ( طائر البوم ) .

كەزەب : جەرگ ، ميّلاك ( الكبد ) .

كەلـەش : ڕێگر ، جوان ( قاطع الطريق ، الحسن الجميل ) .

كێـفەرات : لـەرزينا مرنىّ ، سەكەرات ( سكرات الموت ) .

گورجـىّ : ژنا جوان ( الحسناء ) .

گورچك : گواچيسك ( الكلية ) .

گـەرنـاس : زيرەك ( شجاع ) .

گەور : ڕەنگىّ ب سەر سپى ڤەدچت ، ڕووگەش ( اللون المائل إلى البياض ، نضارة ) .

لـەك : تيپا لـەشكەرى ( فرقة في الجيش ) .

لـەوەند : بەژن زراڤ ( رشيق ) .

ماچين ( چين وماچين ) : وەلاتـىّ چـيـنـىّ وئەو وەلاتێـن ل پشـت ( بـلاد الصـين ومـا وراءها ) .

مەخيـن : فەلـە ( النصراني ) .

نووق : تەنشت ( الجنب ) .

هاويـر : دۆر وڕەخ ( حوالي ، تطويق ) .

هـەژال : كەڤن ( قديم ) .

هەسانى ( هيسانى ) : ساناهى ( سهل ، سهولة ) .

هـەسن : ئاسن ( الحديد ) .

هشت : هيلا ( ترك ) .

هيستـر : رۆندك ( الدموع ) .

هيم : كەڤر ، بەرى مەزن ( الصخر ) .

وەجـل : ترس ( وجل ، خوف ) .

وەرسل : گەھ ( أوصال ) .

يەنـچـەرى : لـەشكەرى ئۆسمانىيين تورك ( الجيش الإنكشاري ) .

# ناڤەرۆك